# بەسەرهاتی پێغەمبەران

## لە قورئاندا

دانەر: ئەبولحەسەنی نەدەوی
وەرگێڕ: عیسا ئەحمەدزادە

# بەسەرهاتی پێغەمبەران

## لە قورئاندا


دانەر:

ئەبولحەسەن عەلی نەدەوی

وەرگێرانی:

عیسی ئەحمەد زادە





انتشارات کردستان

سنە

| | |
|---|---|
| سرشناسه: | ندوی، ابوالحسن‌علی، ۱۹۱۳– م. |
| | .Nadvi, Abulhasan Ali |
| عنوان و نام پدیدآور: | به سەرهاتی پیغەمبەران لە قورئاندا/دانەر ئەبولحەسەنی نەدەوی؛ وەرگیرانی عیسی ئەحمەدزادە. |
| مشخصات نشر: | سنندج: انتشارات کردستان، ۱۳۸٦. |
| مشخصات ظاهری: | ۲۵۲ ص.:.م‌س ۲۱/۵×۱٤/۵ |
| شابک: | 978-964-980-023-3 |
| وضعیت فهرست نویسی: | فیپا |
| یادداشت: | کردی. |
| عنوان قراردادی: | قصص‌النبیین للاطفال. کردی. برگزیده. |
| موضوع: | قرآن — قصه‌ها — ادبیات نوجوانان. |
| شناسه افزوده: | احمدزاده، عیسی، ۱۳۳٦– مترجم. |
| رده بندی کنگره: | BP۸۸/ن٤ق۲۲ ٦۰٤۷۲۲ ۱۳۸٦ |
| رده بندی دیویی: | ج [۲۹۷/۱۵٦] |
| شماره کتابشناسی ملی: | ۵۰۳۰٤۰۱ |



انتشارات کردستان
Kurdistan Publication
سنه - پاساژی عیززەتی - تەلەفوون - ۲۲۶۵۳۸۲

## بەسەرهاتی پێغەمبەران

| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | بەسەرهاتی پێغەمبەران |
| ✓ دانراوی (تألیف): | ئەبولحەسەن عەلی نەدوی |
| ✓ وەرگێراوی (ترجمە): | عیسی ئەحمەدزادە |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول)؛ ۱۳۸۸ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۳۰۰۰ (بەرگ) جلد |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع): | ۲۵۶ صفحەی رقعی |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |

نرخی: شابک: ۳-۰۲۳-۹۸۰-۹۶۴-۹۷۸
۳۰۰۰ تمەنە ISBN: 978 - 964 - 980 - 023 - 3

## پێشەکی، مامۆستای بانگێشتکار[1] شەهید سەیید قوتب

من خاوەنی ئەم کتێبەم لە باری کەسایەتی و قەڵەمەوە بە باشی بۆ ناسرا. بەڕێز ئەبولحەسەنی نەدەویی، هەم دارای دڵێکی خواناسە، هەم خاوەن قەڵەمێکی سەر بە خوایە. بە پیاوێکی وام هاتە بەر چاوان کە، وێڕای بە باشی ناسینی ئیسلام، موسوڵمانانە دەژی و بۆ ئیسلامیش دەژی.

ئەوا هاوڕێ لەگەڵ نووسینی پێشەکییەك بۆ ئەم کتێبە شایەتییەکی راست و پاکیشی لەسەر دەدەم:

بەسەرهاتی پێغەمبەران بۆ مێر منداڵان، یەکێکی تر لە کارە زۆر جوانەکانی ئەبولحەسەنی نەدەویی و برایانی هێژایەتی لە پانتای بانگەشەی[2] ئیسلامیدا. تەنیا ژن و پیاوان نین نیازیان بەوە هەبێ ئیسلامی پاك و باڵاوتەیان پێ پیشان بدرێ، بەڵکوو منداڵانیش هەر پێویستییان بەم بژیوە رۆحییە هەیە، تاکوو، کە پێیان نایە قۆناغی لاوەتی، تامی باوەڕ لە دەروونداو، رووناکی باوەڕ لە دڵدا و سرووەی خۆشییەکەی لە رەواندا هەست پێ بکەن. چیرۆك و بەسەرهاتەکان یەکەمین بابەتێکن، کە دەرکەی دڵە چکۆلەکانیان [بە ئاسانی] بۆ ئاواڵە دەبێ. ئەم کتێبە هەرچەند بۆ مێر منداڵان

---

(١) بانگێشتکار: دەعوەتکار.

(٢) بانگەشە: بانگەواز، دەعوەت.

نووسراوە، زۆرێك لە گەورەكانیش نیازیان بە خوێندنەوەی هەیە. گەلێك لە مەردم بۆیان رێك نەكەوتووە ئەو وانانەی[1] لە ژێر دەسەڵاتی داگیركەر و سەرپەرستی بانگەشەكارانی مەسیحی دا دەخوێنران، فێربین تاوەكوو شتێك لە رووداوەكانی ناو قورئان و مەبەستە قووڵەكانی و كەش هەوا باوەڕیی و كارتێكەرەكانی ـ وەك لەم كتێبەدا خراوەتە بەر چاو ـ تێبگەن.

زۆرم كتێبی منداڵان ـ لە مەڕ بەسەرهاتی پێغەمبەران ـ خوێندووەتەوە. لە میسر لە «كۆمەڵە چیرۆكی ئایینی بۆ منداڵان»دا، كە لە قورئانی پیرۆز وەرگیرابوون بەشداریم هەبوو، بەڵام بێ شیچ چەشنە روو دەربایسیەك دەڵێم ئەمەی كاك ئەبی لحەسەن، كە لە پێش دەستم دایە، لە هەموو ئەوانە داگرتووترە. هۆیەكەشی ئەو رێنموونیە ورد و ئاماژە[2] رۆشنكەرەوانەن كە تیشك دەخەنە سەر مەبەستی رووداوەكان و هەڵوێست و پێوەندییە دەروونییەكان، لە كاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتەكانا. ئاشكرایە وەختێ بە دڵیشەوە نشتن ـ چ دڵی چكۆلە و چ گەورە ـ راستیگەلێكی باوەڕدارانەی زۆر گرنگ دەنەخشێنن.

خوا پاداشی بەڕێز ئەبولحەسەن بداتەوە و یارمەتی زیاتری بدا. مێر منداڵانیش كە بۆران و باگژەی بەهێز گەمارۆیان داون و رێگەیان پڕ لە دڕك و داڵ كردوون و بەرەو تاریكیان هەڵدەنێن و، ئاتاجی رێنموونی و رۆشنایی و سەرپەرستی و دەرباز بوون لە گیروداون، بە هۆی ئەو، شارەزای رێ بكا. سەركەوتن بە خوایە.

**سەیید قوتب**

---

(١) وانە: دەرس.　　(٢) ئاماژە: ئیشارە.

# پێشەکی نووسەر

برازای خوشەویستم!

چاك دەزانم ئەتۆش وەکوو هەموو منداڵانی هاوتەمەنت گەلێك هۆگری چیرۆك و بەسەرهاتی. سەرگوزەشتەکان زۆر جوان گوێ لێدەگری و بە باشی ئەیانخوێنیەوە. بەڵام داخی گرانم من بە دەستی تۆوە وەچیتر نابینم، رازی سەگ و پشیلە و شێر و گورگ و ورچ و مەیموونی لێبەدەر. ئاشکرایە کە ئێمەش [گەورەکان] لەم نێوانەدا خۆمان بە بەرپرس دەزانین و ئەم کتێبەش نموونەیەکە لە بەرهەمەکانی ئەو بەرپرسییەمان.

بێگومان تۆش بۆیە دەستت بە فێربوونی زمانی عەرەبی کردووە و هێندە بە تاسەو دڵگەرمییەوە ملت لێناوە، زمانی قورئانە؛ زمانی پێغەمبەرە و هی ئایینە. بەڵام من هەست بە شەرمەزاریی دەکەم کە تۆ لە ناو ئەو چیرۆکانەدا کە بە زمانی عەرەبی نووسراون، جگە لە بەسەرهاتی گیانلەبەران و راز و ئەفسانەکان شتێکت دەست ناکەوێ، کە لەگەڵ تەمەنت، رێکەوتوو، و گونجاو بێ. هەر لەو رووە وە لێبڕام بەسەرهاتی پێغەمبەران بەشێوازێکی ساکار و سازگار لەگەڵ تەمەن و دڵخوازەکانی تۆدا بۆ خۆت و منداڵانی موسوڵمانی هاواڵت بنووسمەوە. سەرەنجام لێبڕانەکەم هێنایە جێ و،

ئـەمەش یـەکـەمین کـتێبـە لە «بـەسەرهاتی پـێغـەمبەران بـۆ مـنداڵان» کـە پێشکەشتی دەکەم.

[ئەمەش بڵێم] لە دارشتن و گێڕانەوەدا ڕەوشت و سرشتی منداڵانم لەبەر چاو گرتووە، وشەو ڕستەم چـەنجاران نـووسیوەتەوە. لە واژەی خـۆش بـێژ کەڵکم وەرگرتووە و ڕووداوەکانم شیکردۆتەوە. بەهیوام ئەم کتێبە یەکەمین کـتێبـێك بـێت کـە مـێر مـنداڵان بـە زمـانی عـەرەبی دەیـخوێننەوە و لە خوێندگەکانیشیانا بوترێتەوە. بە یارمەتی خوا، هەر بـەم‌زوانـە بـەسەرهاتی پێغەمبەرانی دیکەشت بە شێوازیکی خۆش، و دڵبزوێن، و ڕۆشن، و ئاسان، و کورت و جوان، و دوور لە درۆ و دەلەسە، بۆ بەڕێ دەکەم.(١)

موحەممەدی خۆشەویست! لە خوا دەپاڕێمەوە بتکا بەهۆی ڕووناکـی چاوی دایك و باب و، مامت و، ئیسلام و، ئەو خێر و بێرەش کە بە باپیرانتی دابوو، بەم بنەماڵەیە و هەموو موسوڵمانی ببەخشێتەوە.

**عەلی ئەلحەسەنی**

---

(١) نووسەر، لەوکاتەدا ئەم پێشەکییەی لەسەر یەکەمین بەشی ئەم کتێبە ـکە بە جیا بڵاوکرا بووەوە ـ نووسیبوو. (وەرگێڕ).

# کێ بتەکانی شکاندووە؟

## فرۆشیاری بتان

لەسەردەمانێکی زۆر لەمەوپێش و لە یەکێ لە شارەکاندا ئازەر ناوێك هەبوو. ئازەر پیاوێکی سەرناس و بەناوبانگ وکار و پیشەشی فرۆشتنی بتان بوو. هەر لەو شارەدا خانوویەکی زۆر گەورە کرابووە وە و تەرخان درابوو بە بتخانەوە؛ واتا بتێکیٚ زۆر و زەبەندی تیادا دانرابوو.

مەردمی ئەو رۆژگارە ببوون بە بەندەی ئەو بتانە و ئازەریش خۆی یەکێ لەوانە بوو، کە کڕنووشیان لە بتان دەبرد.

## کوڕی ئازەر

ئازەر کوڕێکی ئازاو لێهاتووی هەبوو، بەناوی ئیبراهیم. ئیبراهیم دەیبینی ئەو خەڵکە سوژەدە لە بتان دەبەن؛ سەرنجی ئەدا بەندایەتی بتان دەکەن. ئەو دەیزانی ئەو بتانە لە بەرد سازدراون. تێگەیشتبوو کە بتان، نە قسە دەکەن و نە هیچیش دەبیستن. دیسان لەوەش ئاگادار بوو کە بت لە تونایدا نییە نە زیانێك

بگەیێنێ و نە قازانجێکیش. دەیدیت مێش پێیانەوە دەنیشێ، بەڵام لە دەسیان نایە راویان نێن. ئەو خۆراکەی بۆیان دانراوە مشك دێن و دەیانخۆن، کەچی ناتوانن دەریان کەن.

ئیبراهیم لەبەر خۆوە، کەوتبوو بە فکر کردنەوەدا: کە وایە ئەم خەڵکە بۆچی کڕنووش بۆ بت دەبەن؟ یان بۆ [بە نیازی بە دیهاتنی ئاوات و ئارەزوویان] هاوار لە بتان دەکەن؟

## پرسیاری ئیبراهیم

ئیبراهیم پێ بە پێی بیرکردنەوە و لێکدانەوە، لە باوکی دەپرسی: بابە گیان! تۆ ئەم بتانە بۆچی دەپەرستی؟ بۆ واکڕنووشیان بۆ دەبەی، یان داوای یارمەتییان لێ دەکەی؟ خۆ ئەمانە نە قسان دەکەن، نە دەشبیستن؛ نە زیانێکیان هەیە و نە بەهرەیەکیش دەگەیەنن!

بابە! بت، نە دەتوانێ شتێك بخوا و نە بیشخواتەوە. کەواتە خواردن و خواردنەوەیان بۆچی بۆ دادەنێن؟ ئازەر بە بیستنی ئەم قسانە هێند تووڕە دەبوو، لە هیچ تێنەدەگەیشت. کاتێ ئیبراهیم خەریکی رێنموونی تایفەکەی خۆی دەبوو، ئەوانیش وەها دەئاڵۆزان[١] هەر لە هیچ حاڵی نەدەبوون.

[دوایی ئیبراهیم] لەبەر خۆوە وتی: کەوایە کاتێ مەردم شاریان چۆڵکرد، ئینجا دەچم و بتەکان تێك دەشکێنم. لەوانەیە ئەم رووداوە ببێتە هۆی چاو کردنەوەو داچڵەکانیان.

---

(١) ئاڵوز: تووڕە.

## ئیبراهیم بتەکان تێك دەشکێنێ

سەرەنجام ڕۆژی جێژن هاتە پێشەوە. دانیشتوانی شار، بە پیرو لاوو گەورە و بچووکەوە بۆ بەشداریی لە ڕێ و ڕەسمی جێژندا لە شارێ وەدەرکەوتن.

باوکی ئیبراهیمیش ڕێککەوت. لە ئیراهیمی پرسی: ئەتۆ لەگەڵمان نایەیت؟ وەڵامی دایەوە: من نەخۆشم!

خەڵکی، هەموو ڕۆیشتن و ئیبراهیم بە تەنیا لە ماڵدا مایەوە. لەم دەرفەتەدا، خۆی گەیاندە لای بتەکان. پاشان ڕووی دەمی لێکردن و وتی: ئێوە بۆ وا فزەتان لێوە نایە؟ بۆ قەت نابیستن؟ ئەی بۆچی دەست بۆ خۆراك و شەربەتەکەتان نابەن؟

بتەکان وسکەیان لێوە نەدەهات بەردێکی ڕەق و تەق، دەم و زمانی کوا تا قسەکردنیشی هەبێ.

ئیبراهیم لێی پرسین چیتانە، بۆ هیچ ناڵێن؟ بتان دیسان هەروا بێدەنگ بوون. لەم کاتەدا ئیبراهیم رقی هەستا، تەوری بۆ هەڵگرتن و چەپ و ڕاست لێیدان. چی بت هەبوو ورد و خاشی کردن، جگە لە دانە گەورەکەیان، کە تەورەکەی لە ملی هاویشت و بەجێی هێشت.

## ئەم کەتنە کێ کردوویە؟

مەردم لە پاش بە جێهێنانی ڕێ و ڕەسمی جێژن، گەڕانەوە بۆ ناو شار و ڕژانە ناو خانووی بتانەوە؛ چوون دەیانویست بە بۆنەی ڕۆژی جێژنەوە

کرنووش لە بتان بەرن. بەڵام کە بینییان تووشی سەرسامی هاتن. ترس و خۆفێکی زۆریان نشتە دڵ؛ خەم و پەژارە دایگرتن و قوشقی بوون. لە خۆیان دەپرسی: «کێ بووبێ ئاوای بە پەرستووەکانمان[١] کردبی؟

هەندێك وتیان: بیستوومانە کوڕە گەنجێکی ئیبراهیم ناو، جارو بار بە خراپی باسی لێوە دەکردن».[٢]

کاتێ هێنایان لێیان پرسی: «ئەرێ ئیبراهیم! تۆ وات لەم پەرەستووانەی ئێمە کردووە؟ وتی: نەخێر، ئەوە کاری بتە مەزنەکەیانە، ئەوا لە خۆشیان بپرسن ئەگەر دەتوانن وڵامتان بدەنەوە».[٣]

مەردم دەیانزانی بتەکان بەردگەلێکی رەق و تەقن. دیسان ئەوەندەشیان ئاگایی هەبوو کە بەرد نە دەدوێ و نە دەشبیستێ. بتە مەزنەکەش هەر بەردێکە لەو بەردانە؛ کە نە دەتوانێ لە جێ خۆی بجووڵێ و نە بڕوا بە رێگەشدا؛ کەوایە لە توانایشیا نییە بت بشکێنێ.

لە وڵامی ئیبراهیمدا وتیان: دەتۆ خۆت چاك دەزانی بت قەت ناتوانێ بدوێ.

ئیبراهیم وتی: دەجا، ئەگەر وایە، ئێوە چۆن بەندایەتی شتێك دەکەن کە نە بەهرەیەك دەگەیەنێ و نە زیانێکیش؟ چۆن چۆنی یارمەتی لە شتگەلێك دەخوازن، کە نە قسەکردنیان هەیە و، نە هیچیش دەبیستن؟ هەر بۆ خۆشتان دەزانن چ دەکەن؟ ئاخۆ ئێوە هەر دارای ئاوەز بن؟ خەڵکەکە ئارەقی شەرمەزارییان دەرداو دەمیان بووبە تەڵەی تەقیو!

(١) پەرەستوو: پەرستراو.
(٢) ئەنبیا: ٦٠، ٥٩.
(٣) ئەنبیا: ٦٣، ٦٢.

## ئاگری سارد

خەڵکی شار تێکڕا کۆبوونەوە [کردیان بە هەراو هووریا] و لە یەکتریان پرسی: چ بکەین و چ نەکەین؟ ئیبراهیم بتەکانی شکاندووین و سووکایەتی بە پەرستووەکانمان کردووە! سزای دەبێتە چی و چۆنی تۆڵە لێبستێنینەوە؟ جواب بوو بەوە: «بیسووتێنن، با لەسەر خواکانتان کردبێتەوە».(١)

پێشنیار جێبەجێ بوو. ئاورێکی دڵخوازیان هێڵدا و ئیبراهیمیان هاویشتە ناویەوە! بەڵام خوا [بە پێچەوانەی چاوەڕوانی ئەوان] پشتیوانی لە ئیبراهیم کرد و فەرمانی بە ئاگر دا: «ئەی ئاگرا بۆ ئیبراهیم سارد بەو، زیانی پێمەگەیەنە».(٢) فەرمان هاتە جێ و ئاور لە ئاستی ئیبراهیم سارد و سازگار بوو. مەردم بە چاوی خۆیان دیتیان هیچ زیانێکی پێناگەیەنێ!

ئامادەبووان، سەرنجیاندا ئاگرەکە کاری لە ئیبراهیم نەکردووە. ئەو هەروا تەندروستە و بەڵکوو خۆشحاڵیشە؛ ئەنجا ئیتر بە تەواویی هەشەکەیاندا و واقیان وڕما.

## پەروەرندەی من کێیە؟

لە ناخی یەکێ لە شەوەکاندا ئەستێرەیەکی گەش سەرنجی ئیبراهیمی ڕاکێشا! لەبەر خۆوە وتی: پەروەرندەی من، ئائەمەیە. بەڵام وەختێ ئەستێرەکە نشت، وتی: نە! پەروەرندەی من ئەمە نییە. پاش ماوەیەك مانگەشەو هەڵات. ئەوسا وتی: ئەمەیە پەروەرندەی من. دوایی کە مانگیش

---

(١) ئەنبیا: ٦٨.　　(٢) ئەنبیا: ٦٩.

نشت، وتی نە! پەروەردگاری من ئەمەش نییە!

[شەو بەسەرچوو]کاتێ هەتاو بە تیشکی زێڕینی جیهانی روون کردەوە، لە دڵەوە وتی: «ئەها! پەروەردگاری من ئائەمەیە، ئەم لە گشتیان گەورەترە».[١] وەختێ ئێوارە بەسەرهات و هەتاو لە ناو تاریکی شەودا ون بوو، دیسان وتیەوە: نەخێرا ئەمەش لە توانایيدا نییە خوای من بێ. خوا زیندووی نەمرە؛ هەر بووی لەناو نەچووە. هێزو دەسەڵاتێکی هەیە هیچکەس و هیچشتێك ناتوانێ کۆڵی پێبدا. ئەستێرە کزە، لە بەرامبەر رووناکی بەیاندا دەبەزێ، مانگەشەو لاواز و کەمهێزە؛ هەتاوی بەسەردا زاڵ دەبێ. هەتاویش هەر کز و کەم دەسەڵاتە، چوون شەو کۆڵی پێئەدا و تەنانەت هەورانیش لە چاوی گوم دەکەن. ئەستێرە پێی ناکرێ یاریدەری من بێ، چوون خۆی ناتەواوە. مانگ بۆ هاریکاریی من ناشێ، چوون خۆی کۆڵپێدراوە. هەتاویش هەر شایانی یارمەتی من نییە، چوون خۆشی کەم و کزیی تیادا بەدیی دەکرێ.

بەس هەر لە خوا ئەوەشێنێتەوە[٢] یارو یاریدەری من بێ، چوون زیندووی هەتا هەتاییە؛ هەرماوی لە ناونەچووە. بەدەسەڵاتێکە هەموو جیهان لە بەرامبەریەوە هیچە.

## پەروەرینی من ئەڵلایە

بەڵێ، ئیبراهیم، بەو ئەنجامە گەیشت، کە پەروەرندەی ئەو ئەڵلایە، چوونکو تەنیا ئەوە زیندووی هەمیشەییە، هەرماوی تیا چوون هەڵنەگرە.

---

(١) ئەنعام: ٧٨.

(٢) وەشانەوە: شیان، پێکەوتن.

بەهێزی کەس پێ نەوێرە. ئیبراهیم تێگەیشت خوا پەروەرێنی ئەستێرەکانیشە! راهێنەری مانگ و رۆژە! هی هەموو بوونەوەرانە!

لە پاشان خواوەن ئیبراهیمی خستە سەر راستەڕێ. گەیاندی بە پایەی پێغەمبەریی و دۆستایەتی خۆی. فەرمانی دایە هۆزەکەی [بۆ خواناسی و خوا پەرستی] رێنموونی بکا، تاکوو پتر لەوە بەندایەتی بتان نەکەن.

## بانگەشەی ئیبراهیم

ئیبراهیم داوای لە گەلەکەی کرد مل لە بەندایەتی خوانێن و دەست لە پەرەرستنی بتان هەڵگرن. لێی پرسین: «ئێوە چ دەپەرستن؟ وەڵامیان دایەوە: بتان ئەپەرستین».(١) پرسی: «دە ئایاکە داوای یارەمەتییات لێدەکەن، دێن بە هاناتانەوە، دەتوانن خێرێکتان ئاراستە بکەن، یان زیانێکتان لێ لادەن؟ وتیان ئاخر باو باپیرانی خۆمان دیتووە هەر بەم چەشنە خەریکی پەرستنیان بون».(٢)

ئیبراهیم وتی:«[دەبا بزانن]، من سوژدە لە بۆ بت نابەم هیچ، دژمنییشیان لەگەڵ دەکەم. من راهێنەری گشت بوونەوەر، ئەپەرستم. ئەو کەسەی دروستی کردووم، خۆشی رێی پێ‌پیشانداوم؛ بژیوم بۆ بەرهەم دێنێ و لە توونیەتیم رزگار دەکا. نەخۆشیش کەوتم، هەر خۆی چاکم دەکاتەوە. ئەممرێنێ و سەر لە نوێ دەمژیێنێتەوە».(٣) بتان نە شتێکیان بۆ دروست دەبێ، نە دەتوانن رێ نوێن بن. لێان نایە تاقە کەسێك لە برسییەتی یان

(١) شوعەرا: ٧١.

(٢) شوعەرا: ٧٤، ٧٢.

(٣) شوعەرا: ٨٢، ٧٨.

توونییەتی رزگار بکەن. ئەگەر مرۆیەکیش تووشی نەخۆشین هات ناتوانن خۆشی بکەنەوە. هەرگیز لە دەستیشیان نایە، نە گیان لە کەس بستێنن، نە پێشی ببەخشنەوە.

## لە بارەگای پادشادا

لە شارەکەدا پاشایەك هەبوو کە زۆر بە دەسەڵات و گەلێکیش تووش و دڵڕەق بوو؛ بە جۆرێکی وا مەردم کڕنووشیان لێ دەبرد. پاشا بیستبووی کە ئیبراهیم تەنیا بەندایەتی خوا دەکاو جگە لەو ئیدی کڕنووش بۆ کەسی تر نابا. بەو بۆنەوە زۆری رك هەستاو هەناردی بەشوێنیا. ئیبراهیمیان هێنا. ئەو لە خوا بەدەر باکی لە هیچ کەس نەبوو.

شا پرسی: ئیبراهیم! بڵێ بزانم پەروەرندەی تۆ کێیە؟ وتی: پەروەرندەی من ئەڵلایە. پاشان پرسی: ئەڵلا، کییە ئیبراهیم؟ وتی: «ئەوەیە گیان دەبەخشی و ئەیشیسێنێتەوە. شا وتی: دەجا منیش گیان دە بەخشم و دەشیسێنم».[1] کابرایەکی بانگ کرد، لێیداو کوشتی. یەکێکی تری هێنایە پێشەوە، بەڵام نەیکوشت.

ئەوسا وتی: [دەبینی] منیش گیان دەبەخشم و دەشیسێنم. ئەوا کابرایەکم کوشت و یەکێکی ترم زیندوو هێشتەوە. شا پیاوێکی سەرسەری و کەم ئاوەز بوو. ئەویش و هەموو مەردمەکەش بت پەرست بوون.

ئیبراهیم دەیویست پاشا و دارو دەستەی لە راستی مەبەست [گیان

(١) بەقەرە: ٢٥٨.

تێکردن و گیان لێ سەندنەوە] تێگەیەنێ. لەو رووەوە بە پاشای وت: «باشە، خوا هەتاو لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێنێ، تۆ [ئەگەر توانات هەیە] لە خۆرنشینەوە هەڵیبێنە».[١]

شا وێڕای سەرسامی، مات و بێدەنگ بوو. شەرمەزاریی دایگرت و قسەیەکی بۆ نەمایەوە.

## بانگێشتنی باوکی

ئیبراهیم پێی خۆشبوو دیسانەوە قسە لەگەڵ باوکی بکا، بەو هۆیەوە پێی وت: «بابەگیان! بۆچی شتێك دەپەرەستی نە دەدوێ و نە دەشبیستێ».[٢] تۆ کڕنووش لە شتێك دەبەی نە قازانجی لێ دەخێزێ و نە زیانیش. «بابە گیان! کڕنووش لە ئەهریمەن مەبە»![٣] وەرە بەندایەتی یەزدانی دەهەندە و دڵسۆز بەجێ بێنە!

بابی لێی تۆڕە بوو، پێی وت: بیبڕەوە و لە بەر چاوم گومبە، ئەگینا لێت دەدەم.

ئیبراهیم کوڕێکی زۆر لە سەرخۆ بوو؛ لە وڵامدا وتی: «بابە! ئاواتی ئاسایش و تەندروستیت بۆ دەخوازم».[٤] من ئەم شارەی بەجێ دێڵم و دەچمە جێگەیەك بتوانم ئەرکی خواپەرستی تیادا بەجێ بێنم.

خەم و پەژارەیەکی قووڵ دایگرتبوو، کەوتبوە سەری بڕوا بۆ وڵاتێکی تر و لە وێدا مەردم بۆ ناسین و پەرستنی خوا رابهێنێ.

---

(١) بەقەرە: ٢٥٨.
(٢) مریەم: ٤٢.
(٣) مریەم: ٤٤.
(٤) مریەم: ٤٧.

## بەرەو مەکە

هۆزەکەی ئیبراهیم خۆی و پاشا و بابی، تێکڕا لە دەستی وەڕەز[1] ببوون. ئەویش لێبڕا کۆچ بکا بۆ وڵاتێکی دی، کە لەوێدا کار و باری ئایینی خۆی جێ بەجێ بکا و پەیامەکەی بە دانیشتوانی ئەوێ ڕاگەیەنێ.

بەو بۆنەوە باوکی بەجێهێشت ولە شار هاتە دەرەوە. هاوڕێ لەگەڵ هاجەری خێزانی ڕێی مەکەیان گرتە بەر. لەو سەر و بەندەدا مەکە مەڵبەندێکی چۆڵ و وشك بوو. نە گژو گیای تیادا شین دەبوو، نە دارو دەوەن. نە بیرێکی لێ بوو، نە چۆم و جۆگەلەیەك. نە مرۆیەکی تیادا دەژیا و نە گیان لەبەرێکیش.

ئیبراهیم گەیشتە پێشەوە و لە مەکەدا گیرسایەوە.

[پاش وچان و حەسانەوەیەك] لە هاجەری خێزانی و ئیسماعیلی کوڕی تاکایەوە.

کاتێ ویستی بڕوا، خێزانی لێی پرسی: ئوخر گەورەم؟ لێرەدا جێمان دێڵی؟ دەتهەوێ بێ ئاوێك و بژیوێك هەروا بەجێما بێڵی!

بۆچی خواوەن فەرمانێکی پێداوی؟ ئیبراهیم وڵامی دایەوە: بەڵێ! ئەمجا هاجەر وتی: کەوایە، ئەو خۆی ناهێڵی تووشی زیان ببین!

## بیری زەمزەم

[وردە وردە] توونیەتی تەنگی بە ئیسماعیل هەڵچنی و زۆری بۆ هێنا!

---

(١) وەڕەز: پەرێشان.

داکی لێبڕاوانە تێکۆشا چۆرێ ئاوی پێ بگەیەنێ. بەڵام ئاو لەکوێ بوو! مەکە نە رۆخانەیەکی تیایە، نە [تەنانەت] چاوانەیەکیش! هاجەر کەوتە هاڵ و دەوان بە دوای ئاودا. لە تەپی سەفاوە هاتەخوار! بە کێوێ مەروەدا سەرکەوت! دیسان لە مەروە بۆ سەفا، بە پەلە پەل و چاوە چاو، چەنجاران رۆیشت و هاتەوە!

راست لەم هەلو مەرجە ناسکەدا خواوەن فریایان کەوت و ئاوی بۆ دایك و فرزەن ئافراند.(١)

ئاو لە عەرزەوە هەڵقوڵی و ئیسماعیل و هاجەر، لیان خواردەوە. ئاو بێ وشکایی هەرهات و بوو بەو چاوانەی زەمزەمە. پەروەرێنی خاوەن شکۆ پیت و پیرۆزی پێ بەخشی ئیستاش هەر ئەو زەمزەمەیە کە خەڵکی لە کاتی «حەج»دا لێ دەخۆنەوە و وەکوو دیاریەکی پیرۆز بۆ وڵاتانی دەبەنەوە.

تۆچی [خوێنەری بەڕێزا] ئاوی زەمزەمت خواردۆتەوە؟

## خەونی ئیبراهیم

ئیبراهیم دوای ماوەیەك گەڕایەوە بۆ مەکە و گەیشتەوە لای ئیسماعیل و هاجەر. بەدیتنی ئیسماعیل دڵی گەلێ کرایەوە. لەو کاتەدا ئیسماعیل هێشتا منداڵێکی چکۆلە بوو. ئەهات و ئەرۆیشت و کایەی دەکرد و هاوڕێ لەگەڵ داك و بابی لە ماڵ ئەهاتە دەرەوە.

ئیبراهیم دڵی بە ئیسماعیل زۆر خۆش‌بوو.

---

(١) ئافراندن: خولقاندن.

[مانگ و ساڵان تێپەڕین] لە یەکێ لە شەواندا ئیبراهیم خەوی دی، خەریکی سەربڕینی ئیسماعیلە.

ئیبراهیم پێغەمبەرێکی راستۆك بوو، و خەونەکەشی خەونێکی بە راستی بوو. وێڕای ئەوەش دۆستی راستەقینەی خوابوو. لێبڕا ئەوەی لە خەودا فەرمانی پێ دراوە جێبەجێی بکا.

بەو بۆنەوە بە ئیسماعیلی وت: «کوڕم! من خەوم بینی خەریکم تۆ سەردەبڕم؛ خۆت چۆنی لێك دەدەیەوە؟

جوابی دایەوە: بابە گیان! چت پێ سپێردراوە ئەنجامی بدە؛ بە یارمەتی خوا بەم زوانە تێدەگەی کە منیش لە خۆڕاگرانم».(١)

ئیبراهیم ئیسماعیلی لەگەڵ خۆ برد و چەقۆیەکیشی هەڵگرت.

کە گەیشتنە «مینا» خۆی ئامادەی سەربڕینی کرد! ئیسماعیلی لەسەر عەرزەکە راخست. ئامادە بوو، و چەقۆکەی نایە ملی. بەڵام لەناکاو دەرکەوت کە خواوەن پێی خۆش بووە هەموان بزانن دۆستی راستەقینەی خوا هەرچی پێ بسپێردرێ بە باشی جێبەجێی دەکا، و ئیبراهیم رەزامەندیی خوای لە گیانی جگەرگۆشەکەی لا گرنگترە. ئیبراهیم گەلێك سەربەرزانە لە تاقیکردنەوەکە دەرچوو.

خوا حەزرەتی جوبرەئیلی وێڕای بەرانێك لە بەهەشتەوە هەناردو پێی وت: ئائەمە لە گیانکە و لە سەربڕینی ئیسماعیل دەست هەڵگرە. خوا ئاکارەکەی ئیبراهیمی زۆر زۆر لا پەسەند بوو. هەر بەو بۆنەوە فەرمانی بە

---

(١) سافات: ١٠٢.

خاوەن باوەڕان دا ـبە یاد و بیرەوەریی ئەو قارەمانەتییەو بە مەبەستی خۆ ڕاهێنان لە ڕێبازی تەوحیدا[١] ـ لە جێژنی قورباندا قوربانی بکەن.

درودو سەلامی خوا لەسەر ئیبراهیم و ئیسماعیل، بنەڕەتدانەرانی فێرگەی برایەتی تێکڕای ئادەمیزاد.

## کەعبە

هەر لە و ساڵانەدا ئیبراهیم دوای ماوەیەك لە مەکە وەدەرکەوت و دیسان هاتەوە. ئەمجارە ئەیویست ماڵێك بۆ جێ پەرستنی خوا [فێرکردنی دەرسی برایەتی بە هەموو دانیشتوانی سەرزەوی] بکاتەوە. ئەڵبەت ماڵانێکی یەکجار زۆر لەسەرزەویدا هەڵخرابوون؛ بەڵام تەنیا تاقە ماڵێك بۆ جێی ڕاگەیاندنی پەیامی داهێنەری جیهان، لە تەواوی جیهاندا نەبوو.

ئیسماعیل حەزی دەکرد لە سازدانی ماڵی خوادا ببێتە ئاریکاری باوکی. ئیبراهیم و ئیسماعیل، لە کێوەکانەوە بەردیان هێنا. ئبراهیم بە دەستی خۆی خانووی کەعبەی کردەوەو ئیسماعیل، شان بە شان یارمەتیدەری بوو.

باوك و فرزەن سپاس و ستایشی خوایان ئەهێنایە جێ و داواکاری بەجێ هاتنی داخوازەکانیان بوون: «پەروەرندەمان! لێمان وەرگری. تۆ بۆ خۆت زۆر بیسەر و زۆریش زانای».[٢]

خوا داخوازەکەی لێ وەرگرتن و بەرەکەتی بە کەعبە بەخشی. ئیستاکە، ئێمە لە هەموو کاتێکی نوێژدا ڕوو لەو قیبلەیە دەکەین. حاوەن باوەڕانیش لە

(١) تەوحید: تاکە پەرستی. (٢) بەقەرە: ١٢٧.

وەختی حەجدا کە دەگەنە لای، بە دەوریا ئەخولێنەوە و لەوێدا نوێژ بەرپا دەکەن.

بەڵێ خوا نزای ئیبراهیم و ئیسماعیلی هێنایە جێ و خێر و بێری ئاراستەی کەعبە کرد.

بارانی دلۆڤانی خوا بڕژێ بەسەر گیانی ئیبراهیم و ئیسماعیل و موحەممەددا.

## خانووی پیرۆز

ئیبراهیم ژنێکی دیکەی هەبوو بە ناوی سارا. لەم خێزانەی کوڕێکی تری بوو کە ناوی نابوو ئیسحاق. ئیبراهیم نشتەجای شام بوو، و ئیسحاقیش هەروا.

ئیسحاق لە شام خانوویەکی بە نیازی گەیاندنی بانگی تەوحید و برایەتی بە مەردم ـهەروەك بابی و براکەی پێش لەو لە مەکە سازیان دابوو ـکردەوە.

ئەو پەرستگەی ئیسحاق لە شام دروستی کرد، خانووی پیرۆز «بیت المقدّس» واتا «مسجد الاقصیٰ»ی ئێستایە، کە خوا خێر و بێری بە دەورو بەری بەخشیوە. خواوەن فەڕ و فراوانی ئاراستەی بەرەی ئیسحاق کرد؛ هەروا کە ئاراستەی تۆرەمەی[1] ئیسماعیلی کرد و پێغەمبەر و فەرمانڕەوای زۆریان لێکەوتەوە.

ئیسحاق بوو بە باوکی کوڕێك بە ناوی یەعقووب، کە گەیشت بە پایەی پێغەمبەرایەتی.

(١) تۆرەمە: بنەچەکە، نەژاد.

یەعقووب بوویە بابی دوازدە کوڕ، کەیەك لەوانە یۆسف بوو. یۆسف ـ لە قورئاندا ـ سەرگوزەشتەیەکی پڕ سەیرو سەمەرەی هەیە. ئەوە تۆو ئەوەش بەسەرهاتەکەی.

# دڵگیرترین بەسەرهات

## خەونێکی بەلاجەوی

کاتێ یۆسف منداڵێکی چکۆلە بوو، یازدە برای هەبوو. بەڵام چوون هەر لەو تەمەنەشدا کوڕێکی جوانکیلە و زۆر وتو وریا بوو، یەعقووبی باوکی ئەوی لە تەواوی برایانی خۆشتر دەویست. یۆسف شەوێکیان خەوێکی سەر سوڕهێنەری بینی، دیتی یازدە ئەستێرە هاوڕێ لەگەڵ مانگ و رۆژ سەری لێ دەخەوێنن. یۆسفی منداڵ ئەمەی گەلێك پێ سەیر بوو! ئەم خەونەی بۆ لێك نەئەدرایەوە، کە چۆن چۆنی ئە ستێرە و مانگ و رۆژ سەر بۆ مرۆ[1] دەچەمێنن؟ بەو هۆیەوە چوو بۆلای بابی؛ خەونەکەی بۆ گێڕایەوە و وتی: «باوە! ئەمن یازدە ئەستێرە و مانگ و رۆژم دیت سەریان لێ دەخەواندم!».[2]

یەعقووب کە خۆی پێغەمبەر بوو بە بیستنی ئەم خەوە پڕ بە دڵ خۆشحاڵ

(١) مرۆ: مرۆڤ، ئینسان. (٢) یۆسف: ٤.

بوو، و پێی وت: یا خوا لێت پیرۆز بێ یۆسف گیان! تۆ، لە داهاتوا دەگەییە پلە و پایەکی زۆر بڵند.

ئەم خەوە، مژدەی [گەیشتن] بە زانایی و پێغەمبەرایەتییە خوا خەڵاتی خۆی بە ئیبراهیم و ئیسحاقی باپیرت بەخشی و دیسان ئەیدا بە تۆ و تیرەی یەعقووبیش.

یەعقووب کە پیرێکی بەساڵا چوو بوو، لە رەوشت و ئاکاری خەڵکی بە باشی ئاگادار بوو. دەیزانی شەیتان چۆن بەسەر دڵ و دەروونی ئادەمیزادا زاڵ دەبێ و ئەیکاتە گاڵتە جاڕی خۆی.

بەو بۆنەوە بە یۆسفی وت: کوڕی بابی! ئەم خەونەت بۆ هیچکام لە براکانت نەگێڕیەوە! چوون بەخێڵیت پێ ئەبەن و دژایەتییت[1] لەگەڵ دەکەن.

## ئێرەیی برایان[2]

یۆسف لە دایکی خۆی برایەکی‌تری هەبوو. ناوی ئەو برایە بنیامین بوو. یەعقووب خۆشەویستییەکی تایبەتی سەبارەت بەم دوو کوڕەی هەبوو، تا رادەیە کە هیچکەسی‌تری ئەوەندە خۆش نەدەویست. هەر لەبەر ئەوەش براکانی‌تریان ئێرەییان بە یۆسف و بنیامین دەبرد و رقیان لێهەستابوون.

لە ناو خۆیانا ئەیانوت: بۆ وا بابمان یۆسف و بنامینی ئەو هەمووە خۆش‌ئەوێ؟ هۆی چییە ئەو جووتە، باوەکوو هێشتا چکۆلەو هیچ لە دەس‌نەهاتوون، ئەوەندە کەوتوونە بەر دڵی باوکمان‌نەوە؟ ئەی بۆ ئێمەی

(١) دژایەتی: دژمنی.

(٢) ئێرەیی: بەخێلی.

وەکوو ئەوان خۆش ناوێ، خۆ ئێمە هەموو گەنج و بەتواناین وکار و باریشمان پێ جێبەجێ دەبێ، ئەمە شتێکی سەیرە؟ یۆسف چوون منداڵ و دڵساف بوو خەوەکەی بۆ برایانی گێڕایەوە و ئەوانیش بە بیستنی ئەو قسەیە زۆرێك تووڕە بوون و پتر لە جاران بەخیڵی لەناو دڵیانا سەری هەڵدا.

رۆژێکیان هەموو یەکیان گرتەوە [هێندێکیان]وتیان: یان یۆسف بکوژن، یاکوو بیبەن لە مەڵبەندێکی دووردەسا بەجێی بێڵن ئەگەر واتان کرد، ئەمجا ئیتر دڵی بابتان سەبارەت بە ئێوە یەکلانە دەبێتەوە. یەکێکیان وتی: نەء، بیبەن بیخەنە ناو بیرێکی سەرەرێگەوە؛ دوایی رێبوار ئەیدۆزنەوە و لەگەڵ خۆیانی دەبەن. هەموان پێکەوە ئەم راوێژەیان پەسەند کرد.

## تێکڕا بۆلای یەعقووب

پاش ئەوەی لەسەر ئەو راوێژە یەککەوتن، هاتن بۆ لای باوکیان. یەعقووب سەبارەت بە یۆسف هەر لەدڵە راوکێدا بوو، بۆی دەرکەوتبوو برایانی نە تەنیا خۆشیان ناوێ ئیرەییشی پێ دەبەن. لەبەر ئەوەش لەگەڵ ئەوانا، بۆ هیچ لایەکی نەدەهەنارد. یۆسفیش بەس لەگەڵ بنیامینی برایا گەمەی دەکرد و ئەوەندە دوور نەدەکەتەوە.

برایان ئاگایان لەو کەین و بەینە هەبوو، بەڵام بەسەر ئەوەشدا لێبڕابوون ئەو نەخشە شوومەیان جێبەجێ بکەن. لە یەعقووبیان پرسی: بابە! تۆ بۆ یۆسف لەگەڵ ئێمە نانێریە دەرێ؟ لە چی دەترسی؟ ئەو برا و خۆشەویستی ئێمەیە و برای بچووکیشمانە. ئێمە هەموومان کوڕی یەك باوکین. چەند برا هەمیشە پێکەوە یاریی دەکەن؛ کە وایە ئێمەش بۆ نەچین پێکەوە خەریکی

گەمەو گاڵتە بین؟

:«بەیانی بیخە تەکمان با بەناو چیمەن و سەوزەڵانیدا، تۆزێ پیاسە بکا، خۆمان ئاگاداریی لێ دەکەین».(١)

یەعقووب پیرە پیاوێکی دنیا دیە و نەرم و نیان بوو. قەتی پێ خۆش نەبوو یۆسفی لێ دوور بکەوێتەوە، ترسێکی زۆری لەو پێوەنییەدا لە دڵابوو.

لە وڵامی کوڕانیدا وتی: «ئەترسم گورگ بیخواو ئێوە پێی نەزانن!»(٢)

وتیان: هەرگیز! چۆن چۆنی لەناو ئێمەدا گورگ دەیخوا!؟ بە بەرچاوی ئێمەی جەوان و بەهێزەوە چۆنی دەخوا؟ پاشان یەعقووب رێی دا، یۆسف [بۆ گەشت و سەیران] لەگەڵیان بڕوا.

## بەرەو دارستان

برایان لەوەی یەعقووب هێشتی یۆسف هاوڕێتییان لەگەڵ بکا خۆشییەکی زۆریان کەوتە دڵ.

هەستان و روویان کردە دارستانێك. لەوێدا یۆسفیان هاویشتە ناو بیرێکەوە. نە بەزەییان بە یۆسفی منداڵا هاتەوە، نە بە یەعقووبی پیری بەساڵا چوودا.

یۆسفی چکۆلە و کەمدڵ لە ناو بیرێکی قووڵ و تاریکا بە تاقی تەنیا مایەوە.

بەڵام خواوەن هات بە هانایەوە. مزگێنی دایە و پێی فەرموو: دڵگران

(١) یۆسف: ١٢.	(٢) یۆسف: ١٣.

مەبەو مەشترسە! تۆ خوات لەگەڵدایە و لە داهاتووشا دەگەییە پایەیەکی بڵند. برایانت تێکڕا دێنەوە بۆلای تۆ و لەوکارەی کردوویانە ئاگاداریان دەکەی.

کە لە پیلانەکەیان بوونەوە و یۆسفیان خستە ناو چاوانەکە، کۆبوونەوە و وتیان: جا ئیستا، جوابی بابمان چۆن بدەینەوە؟ یەکێ لە برایان وتی: بابم هەر ئەیوت: ترسم هەیە گورگ بیخوا. کە واتە ئێمەیش پێی دەڵێن: بابە! ئاخری قسەکەت بەراست دەرچوو! یۆسف گورگ خواردی!.

هەموویان لەسەر ئەم رایە بوون بە هاودەنگ کە: بەڵێ، دەبێژین: بابە گورگ خواردی.

یەکێکی تریان پرسی: باشە ئەی بۆ قەناعەت پێکردنی بەڵگە و نیشانەمان چ بێ؟ جواب درایەوە: ئاشکرایە بەڵگەی رووداوێکی وەها، خوێنە.

ئێنجا مەڕێکیان سەربڕی، کراسەکەی یۆسفیان پیا ژەند و خوێناوڵیان کرد.

ئەم کارەیان بوو بە هۆی خۆشحاڵی هەموو لایەکیان. وتیان: ئائێستا ئیتر قسەکەمان بۆی، جێی باوەڕ دەبێ.

## لە بەرابەر یەعقووبدا

لە تاریکی پاش خۆربەڕدا، بە دەم گریانەوە، هاتنەوە بۆ لای باوکیان. پێیانوت: بابە گیان! یۆسفمان لەلای کەلوپەلەکەدا جێهێشت و خۆمان خەریکی بە راو گرکێ بووین، هەتا هاتینەوە گورگ خواردی. کراسەکەشیان کە خوێنە درۆزنەی پێوە بوو، هێنا و وتیان: بۆ درۆ و راستی، ئائەوەش خوێنەکەی یۆسف!

باوکیان جگە لە وەی پێغەمبەر بوو، دنیاشی کۆنە کردبوو؛ بە ئەزموون‌تر بوو لە کوڕەکانی. ئەیزانی ئەگەر کەسێك گورگ بیخوات وێڕای بریندار کردنی، جل‌وبەرگەکەشی شیتاڵ دەکا؛ کەچی کراسەکەی یۆسف ساق بوو، هەر خوێنی پیادا رژا بوو. تێگەیشت کە ئەوە خوێنە درۆزنەیە و باسی گورگیش هەر باسێکی هەڵبەستراوە.

پێی وتن: ئەمە قسەیەکە خۆتان دروستان کردووە و منیش هیچ چارەیەك شك نابەم خۆڕاگریەکی شیاوی لێ بەدەرا پەژارەی یەعقووب بە شوێن یۆسفدا پەژایەکی ئارام‌لێبڕ بوو؛ بەڵام ئەو ملینا لە خۆڕاگریەکی دوور لە ناشوکریی.

## یوسف لەناو چاوانەدا

برایان هاتنەوە بۆ ماڵ و یۆسفیان لە ناو چاوانەدا بەجێ‌هێشت، ئەوان نانیان خوارد. پاشان ئاسوودە لەسەر رایەخەکان لێی‌راکشان و خەوتن.
یۆسفیش لە بنی‌چاوانەدا بێ بژیو و بێ رایەخ لە دڵەراوکێ‌دا بوو.

برایان یۆسفیان لە بیر بردەوە و بۆی نووستن. یۆسف نە نووست و نە کەسیشی لەبیر بردەوە.

یەعقووب هەر لە پەژارەی یۆسفدا بوو؛ یۆسفیش هەر بەیادی یەعقووبەوە. یۆسف لە بنی بیرەکەدا بوو و بیرەکەش زۆر قووڵ بوو. بیر لەناو دارستانێکا بوو، دارستانیش گەلێك سامناك! کاتیش کاتی شەو بوو؛ شەوێکی تاریك و نووتەك!

## لە بنی بیرەوە بۆ ناو کۆشك

دەستەیەك کاروانی ڕێیان کەوتە ناو دارستانەکە، توونیەتی زۆری بۆ هێنان و کەوتنە گەڕان بە دوای بیردا. بیرێکیان دۆزیەوە و کابرایەکیان هەنارد ئاویان بۆ بێنێتە سەر. کابرا ڕۆیشت و دۆڵچەکەی هاویشتە ناو ئاوەکەوە. وەختێ قورس بوو هەوڵیدا بیکێشێتە سەر! کە سەرنجی دا ئەوا کوڕێکی تیادایە! بە سەرسامییەوە هەرای کرد: «مزگێنیم دەنێ، ئەمە کوڕێکی چکۆلە!»(١)

کاروانییەکان بە چاوپێکەوتنی زۆرێك خۆشحاڵ بوون و خێرا شاردیانەوە. کاتێ گەیشتنە میسر، بارەکانیان لە بازاڕ داخست و قاویان کرد: کێ ئەم کوڕەمان لێ دەکڕێ؟

فەرمانڕەوای میسر بە پوولێکی کەم لێی سەندن.

بەڵێ، بازرگانان یۆسفیان نەناسی و فرۆشتیان! فەرمانڕەوا یۆسفی بردەوە بۆ کۆشکی خۆی و بە خێزانی وت: ڕێز و حورمەتی یۆسف بگرە، چوون کوڕێکی وشیارە.

## ئەمەگناسی و ئامانتداری

[کە یۆسف گەورە بوو و جوانیی گەشەی سەند] خێزانی عەزیز [فەرمانڕەوا]ی میسر گیرۆدەی ئەوینی بوو و لێی پێچا دڵداریی لەگەڵ بکا.

---

(١) یۆسف: ١٩.

بەڵام یۆسف نەی لێکرد و پێی‌وت: هەرگیز! ئەمن خیانەت بە گەورەی خۆم ناکەم. عەزیز چاکەی بۆ من هەبووە و جوامێرانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردووم. من شەرمی خوا سەرا پای داگرتووم.

زلێخا رکی لێ‌هەستا و لای فەرمانڕەوا شکاتی لێکرد. پاشان بۆ فەرمانڕەوا روون بووەوە یۆسف کوڕێکی خاوێن و راستۆکە و خێزانی درۆی لەگەڵ کردووە. بەو هۆیەوە بە زلێخای وت: «بەڕاستی تۆ لە تاوانبارانی».[1]

جوانی و دڵڕفێنی یۆسف لە میسردا وەها ناوی داخستبوو، ئەوەی دەیبینی ئەیوت: «ئەمە کەی لە جینسی ئادەمیزادە، گومانی تێدا نییە کە فریشتەیەکی هێژایە».[2]

تووڕەیی زلێخا زۆری سەند و بە یۆسفی وت: ئەگەر بە گوێم نەکەی، کارێك دەکەم بکەویە زیندانەوە! یۆسف لە جوابدا وتی: «من چوونە زیندانم پێ‌خۆشترە لەوەی تۆ لێم دەخوازی!»[3]

دوای ماوەیەك رای عەزیز هاتە سەر ئەوە یۆسف بنێرێتە بەندیخانەوە. واتا، بەسەر ئەوا دەیزانی یۆسف تاوانێکی نییە، هەر رەوانەی بەندیخانەی کرد.

## ئامۆژگاریی زیندان

کاتێ یۆسف خرایە زیندان بۆ هەموو ئەوانەی لە زیندانەکەدا بوون دەرکەوت کە گەنجێکی جوامێرە. هەم زانا و تێگەیشتووە، هەم زۆریش

---

(١) یۆسف: ٢٩.
(٢) یۆسف: ٣١.
(٣) یۆسف: ٣٣.

دڵسۆز و خێر خوازی مەردمە.

دانیشتوانی بەندیخانە خۆشەویستی یۆسفیان کەوتە دڵەوە. ڕێز و حورمەتێکی فروانیان بۆ دادەنا و بە چاوپێکەوتنی دەگەشانەوە.

دوو پیاوی تریش لەگەڵ یۆسف کەوتنە زیندان و ئەو خەوانەی دیبوویان بۆیان گێڕایەوە. یەك لەوانە وتی: «من خەوم دی، ترێ دەگووشم. ئەوی‌تر گێڕایەوە: من لە خەوما نانم لەسەر سەرە و پەلەوەر خەریکن ئەیخۆن».(١)

لە یۆسفیان داواکرد بۆیان لێکبداتەوە. یۆسف یەکێك بوو لە پێغەمبەران و لەسەردەمی ئەویشا مەردم لەجێی خوا بەندایەتی شتی‌تریان دەکرد. هەر دەستەو بە دەستەیەك خوایەکیان بۆ خۆیان دانابوو. بۆ نموونە، خوای وشکی و خوای دەریا و هی ڕۆژی و هی بارانیان هەبوو.

یۆسف کە ئەو شتانەی دەبینی، بە بیروباوەڕی ئەو خەڵکە پێکەنینی دەهات و جارویار بۆ سەرلێشێواویشیان دەگریا. ئەو لێبڕابوو مەردم تێگەیەنێ و ڕاستەڕێی ناسین و پەرستنی خوایان پێ نیشان بدا. خواستی پەروەردگاریش وابوو، ئەوکارە لە بەندیخانەوە دەست پێ‌بکا.

بۆ مەگەر ئەوانەی لە زیندانان، شایانی ڕێنموونی نین؟ نیازیان بە خزمەت و دڵسۆزی نییە؟ دانشتوانی زیندان ئادەمیزاد و بەندەی خوا نین؟

بەڵێ، یۆسف لە بەندیخانەدا بوو، بەڵام هەر لە ویشدا سەربەست و بوێر بوو. دەست کورت بوو؛ بەڵام دەسگوشاو دڵاوا بوو. پێغەمبەران لە هەر شوێن و جێگایەکا، ڕوونکەرەوەی حەق و ڕاستین؛ لە هەر کات و ساتێکا

---

(١) یۆسف: ٣٦.

خێر و بەهرە بە مەردم دەگەیەنن.

## لێزانیی یۆسف

یۆسف لەبەر خۆیەوە خەریکی بیرکردنەوە بوو: ئێستا، ئاتاجی ئەم دوو کەسەی لە من نزیك کردووەتەوە. بنیادەمی ئاتاجیش هەم نەرم و نیانە، هەم گوێڕایەڵ؛ قسان دەبیستێ و بەرفەرمانیشە. ئەگەر ئێستا شتێك بەم دوانە بڵێم، ئەوان لێمی وەردەگرن و دانشتوانی زیندانیش هەروەری دەگرن. بۆیە پەلەی نەکرد و پێی وتن: من بەر لەوە ژەمە نانتان بۆ بێنن مانای خەوەکانتان پێ دەڵێم.

کابراکان دانشتن و بە دڵنیاییەوە گوێیان بۆ راگرت. پاشان وتی: «من زۆر چاك دەزانم خەو لێکبدەمەوە و ئەمەش لەو بەهرانەیە کە پەروەرێنم پێی فێرکردووم».[(١)] پیاوەکان هەردوو خۆشحاڵ و دڵ ئاسوودە بوون. لێرەدا یۆسف هەلی بۆ هەڵکەوت، کە رێنموونی دەست پێ بکا.

## پەندی یکتاپەرستی

درێژەی بە قسەکانی داو وتی: ئائەمەش لەو شتانەیە کە پەروەرێن تێی‌گەیاندووم. خوا زانینی خۆی بە هەموو کەس نالێ و رازی خۆی لای هاوبەشدانەر نادرکێنێ.

ئەزانن هۆی چییە خوا زانینی فێری من کردووە؟ «هۆکەی ئەوەیە، من

---

(١) یۆسف: ٣٧.

ڕێی هاوبەش بۆ دانانم وەلا ناوە و کەوتوومە سەر ڕێبازی ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووبی باو و باپیرم. بۆ ئێمە قەت ڕەوا نییە هاریکار بۆ خوا دابنێین».[١] تاکەپەرستیش بەرگێك نییە بڕابێ بە باڵای تەنیا ئێمە؛ «تەواوی خەڵکی دەبێ تاکە پەرست بن. ئەمەش چاکەیەکە خوا لەگەڵی کردووین، بەڵام زۆربەی مەردم هەر پێنەزانن».[٢]

ئەوسا یۆسف تۆزێ بێدەنگ بوو، لێی پرسین: ئێوە دەبێژن: خوای وشکی و خوای دەریا و خوای ڕۆزی و خوای باران! ئێمەی تاکە پەرست دەڵێین: خوای تەواوی بوونەوەر! دەجا خۆتان بڵێن بڕوا بە چەندین خوا چاکترە، یان خوایەکی تەنیای زاڵ بەسەر هەموو شتدا؟[٣] خواکانی وشکی و هی دەریا و هی ڕۆزیی و هی باران لەکوێدان؟ «پێم بڵێن بزانم کام بەش لەم سەرزەوییە ئەوان سازیان داوە؟ یا لە دروسکردنی ئاسمانەکانا چ بەشداریەکیان هەبووە؟»[٤] سەرنجی ئاسمان و زەوی و سەرنجی ئادەمیزاد بدەن، بەدیهێنەری هەموویان تەنیا ئەڵڵایە! «ئەوانەی جیا لەون چییان دروست کردووە؟»[٥]

پەروەرێنی وشکی و زەریا و پەروەرندەی ڕۆزی و باران چۆن چۆنین؟!.

«ئەوانە چەند ناوێکن ئێوەو باپیرانتان دروستان کردوون».[٦] تەواوی دەسەلات هی خوایە، خاونیەتی بۆ خوایە، ئەم ئەرزەی ئێمەی لەسەر دەگەڕین هی خوایە و فەرمانیش هەر فەمانی خوایە. «کەوایە کەس

---

(١) یۆسف: ٣٨. (٢) یۆسف: ٣٩.
(٣) یۆسف: ٣٩. (٤) ئەحقاف: ٤.
(٥) لوقمان: ١١. (٦) یۆسف: ٤٠.

مەپەرستن جگە لەو. ئایینی ڕاست و دروست هەر ئەمەیە، بەڵام زۆربەی خەڵکی دنیا تێناگەن».(١)

## لێکدانەوەی خەو

دوای ئامۆژگاری، خەوەکانی بۆ لێکدانەوە و وتی: «یەکێکتان دەبێ بە مەیگێڕی ئەرباب و ئەوی‌ترتان لە دار ئەدرێ و پاشان پەلەوەر چینەی لەسەر دەکەن».(٢)

بە یەکەمیانی وت: «کە چوویەوە لای ئەربابت باسی منی بۆ بکە».(٣)

هەردو لە زیندان رزگار بوون. یەکەمیان بوو بە مەیگێڕی پاشاو دووەمیان لە دار درا.

مەیگێڕ لەبیری چوو باسی یۆسف بۆ پاشا بگێڕێتەوە؛ لە ئەنجامدا یۆسف چەن ساڵێك لە بەندیخانەدا مایەوە.

## خەونی پاشا

پاشای میسر خەونێکی سەرسوڕهێنەری بینی. حەو گای قەڵەوی دی، حەوت مانگای لەڕو لاواز ئەیان خواردن؛ حەوت گوڵە دەخڵی سەوز و حەوتی وشکەڵا تووشی بینی.

پاشا لەم خەوە بەڵاجەویەی سەری سوڕما و سەبارەت بە ماناکەی پرسیاری لە نزیکانی خۆی کرد. ئەوان وتیان: شتێکی تیادا بەستە نییە؛

---

(١) یۆسف: ٤٠. (٢) یۆسف: ٤١.

(٣) یۆسف: ٤٢.

خەوتوو، شتی زۆر دەبینێ کە هیچیان ڕاست نین. بەڵام مەیگێڕ وتی: وانییە؛ من لە مانای ئەم خەوە ئاگادارتان دەکەم.

چوو بۆ بەندیخانە و بۆ خەونی پاشا لە یۆسفی پرسی. یۆسف مرۆیەکی هێژا و جوامێر بوو، دڵسۆزی هەموو کەس بوو. پیاوێکی پیاوانە کە وا ڕشدیی نەدەناسی.

خەوەکەی بۆ لێکدایەوەو ڕاشیسپارد چ بکەن. پێی ڕاسپاردن: حەوت ساڵ لەسەر یەك خەریکی کشتو کاڵ بن، ئەمجا دانەوێڵەی بەرهەم هاتوو هەر لە ناو گوڵەکانیانا ـجگە لەوەی لەو ماوەیەدا دەخورێ ـ بهێڵنەوە.

دوای ئەو چەند ساڵە قاتو قڕیەك بەسەردا دێ و ئێوە ـکەمێکی لێ بەدەرـ چیتان پاشەکەوت کردووە دەیخۆن. دەورانی قاتوقڕ حەوت ساڵان دەخایەنێ، پاشان وڵات بە دەخڵو دان ئەڕازێتەوە و خەڵکی تێر و تەواو دەبن. مەیگێڕ گەڕایەوە بۆ لای پاشاو مانای خەوەکەی پێ ڕاگەیاند.

## پاشا ئەنێرێ بە دوای یۆسفدا

پاشا، کە مانای خەوەکەی و وێڕای ئەوەش ڕاسپێرییەکەی بیست، دڵی گەشایەوە. پرسی لێکدەرەوەی ئەم خەوە کێیە؟ ئەو مەردی مەیدانە کە ئاوا دڵسۆزانە ڕێمان بۆ دادەنێ!؟

مەیگێڕ وتی: ئەمە هەر ئەو یۆسفی ڕاستۆکەیە؛ ئەوەی هەواڵی بە من دا لە داهاتوویەکی نزیکا دەبمە مەیگێڕی پاشای سەروەرم!

شا، کەڵکەڵەی دیتنی یۆسفی کرا. هەناردی بەشوێنیا و وتی: «ئا بۆمی

بێنن با بیکەم بە هاریکاری تایبەتی خۆم».[(١)]

## یۆسف خوازیاری تاقیق دەبێ

کاتێ هەنێردراوی شا چوو بۆ لای یۆسف و پێی وت: شا تۆی دەوێ، ئەو ئامادە نەبوو بەو ئاسانییە لە زیندان بێتە دەر! چوون مەردم [ئەکەوتنە سرتە سرت و] ئەیانوت: ئەمە هەر ئەو یۆسفەیە کە بە تاوانی دڵداریی لەگەڵ ژنی شا لە بەندیخانەدا بوو!

یۆسف پیاوێکی مەند و بەرکەتی[(٢)] بوو. ئاوەزمەندێکی ورد بین بوو. ئەگەر لە باتی ئەو هەر کەسی‌تر ئاوا توندی زیندان بکرایە و پیاوی شا چووبا بۆ لای و پێی بوتایە شاکاری بە تۆیە و چاوەڕێتە، بێ‌گومان بە هەوڵە هەوڵ لە دەرکەی بەندیخانە، وەدەردەکەت. بەڵام ئەو قەت هەوڵ نەبوو هیچ پەلەشی نەکرد. بەڵکوو بە راسپاردەی شای راگەیاند: ئەمن خوازیاری لێکۆڵینەوەم. داواکاری خستنە بەر باسی کێشەکەی خۆمم.

ئینجا شا سەبارەت بە یۆسف کەوتە لێکۆڵینەوە. بۆ شا خۆی و بۆ مەردمیش روون بووەوە کە یۆسف مرۆیەکی پاکی دوور لە گەندەکارییە. ئەوسا بەسەر بڵندییەوە هاتە دەر و شاش بەڕێز و حورمەتێکی زۆرەوە پێشوازیی لێکرد.

---

(١) یۆسف: ٥٤.

(٢) بەرکەتی: هەڵکەوتوو.

## بەرپرسیی گەنج و دارایی وڵات

یۆسف چاك دەیزانی ئامانەتداریی لە ناو كۆمەڵداكەم وكزە و دەسپیسی و ناراستی تەنگی هەڵچنیوە. دەیبینی مەردم لە ماڵ و مڵكی خوادا خەریكی گزی و گەندەكارین. دیسان سەرنجی ئەداگەنج و ماڵی سەرزەوی باوەكوو یەكجار زۆرە، بەفیڕۆ دەڕوا. هۆی بەفیڕۆ چوونەكەشی لەوە دایە فەرمانڕەواو كارگێڕان شەرمی خوایان لە دڵدا نییە. سەگەكانی ئەوان تێر و تەسەلن، بەڵام مەردم بە سكی برسی دەژین، بنەماڵەكانی ئەوان لەوپەڕی پۆشتەو پەرداخی دان، كەچی خەڵكیتر رووت و بێ بەرگن

گەنج و سەرمایەی وڵاتیش بەهرەیەكیان بۆ مەردم نابێ تا بەرپرسێكی زانا و خۆ پارێزیان بۆ پەیدا نەبێ. بەرپرسی ناشارەزا نازانێ سەرمایە چییە و چۆنی كەڵك لێوەردەگیرێ؛ ئەوەش كە زانایە بەڵام خۆ نەپارێزە، دیارە بە دڵخواز بەختی دەكا.

یۆسف كە خۆی پیاوێكی تێبین[١] و خۆپارێز بوو، لێبڕا نەهێڵی كارگێڕان ماڵ و مڵكی مەردم تاڵان كەن. ئەو پێی نەدەكرا چاودێری مەردم بێ و لە پێناو راستیشا باكی لەكەس نەبوو، هەر بۆیەش بە پاشای وت: «ئەگەر بمكەیە بەرپرسی گەنج و دارایی وڵات، چاودێریی لێدەكەم و لێشی دەزانم».[٢]

یۆسف سەلماندی كە پارێزگاری بەراستی گەنج و ماڵی میسرە، چوون مەردم كەوتنە ئاسایش و سپاسی خوایان بەجێ هێنا.

(١) تێبین: رۆشنبیر.

(٢) یۆسف: ٥٥.

## برایانی یۆسف دێن

هەروا کە یۆسف رایگەیاندبوو، قاتی و برسێتی لە میسر و شاما سەری هەڵدا. لە شام قاو داکەوت و یەعقوبیش بیستی کە پیاوێکی دلۆڤان لە میسردایە، گوایە ئەو پیاوە دڵسۆز و جوامێرە بەرپرسی گەنج و بەرو بووی وڵاتە و مەردم کە دەچن بۆ لای بژیو [دەخڵودان]یان ئەداتێ.

یەعقووب کوڕەکانی بە تەختێ پارەوە هەنارد بەڵکوو لە میسر بژیوی پێ بکڕن.

بنیامین بەلای باوکییەوە دانیشت. چوون یەعقووب زۆری خۆشدەویست، حەزی نەدەکرد لێ دوور کەوێتەوە. چۆن بۆ یۆسف هەستی بە مەترسی دەکرد، بۆ بنیامینش هەروا بوو. برایانی یۆسف هاتن بۆ لای، بەڵام هەر بە زەینیانا نەدەهات ئەوە یۆسفی برایان بێ. نەیاندەزانی ئەمە یۆسفی ناو بیرەکەیە. پێیان وابوو ئەو هەر لەوێدا مردووە. جا، کام عەقڵ ئەیگرت لە ناو بیرێکی ئەوەندە قووڵدا نەمردبێ! لە بیرێکی هەڵکەوتوو لە ناخی دارستانێکی سامناك و لە شەوەزەنگێکی وەهادا!؟

برایانی یۆسف گەیشتنە پێشەوە. «بۆ چاوپێکەوتنی چوونە ژووری، ئەو ناسینیەوە و ئەمان نەیانناسی».(١) بەڵێ ئەمان یۆسفیان لا ناتاشنا بوو. بۆیان نەناسرا؛ بەڵام ئەو، برایانی وێنا کرد و ناسینی. یۆسف زانی ئەمانە ئەو کەسانەن هاویشتیانە بیرەکەوە. هەر ئەو پیاوانەن کە ویستیان لەناوی بەرن،

---

(١) یۆسف: ٥٨.

بەڵام خوا پاراستی و نەیهێشت؛ بەسەر ئەوەشدا، نە شتێکی پێوتن، و نە سووکایەتییەکی پێ کردن.

## وتوویژی یۆسف و برایان

یۆسف سەری قسەی لەگەڵ داخستن و وتی: ئێوە خەڵکی کوێن!؟

وتیان: خەڵکی کەنعانین.

پرسی کوڕی کێن؟

وتیان: ئێمە کوڕی یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمین (سەلامی خوایان لێ بێ).

پرسی: ئەی برای تریشتان هەیە؟

جوابیان دایەوە: بەڵێ؛ برایەکی دیکەمان هەیە، بنیامینی ناوە!

وتی: ئەی ئەو بۆچی لەگەڵتان نەهات؟

وتیان: ئاخر بابمان لای چۆڵ ناکاو حەز ناکا لێی دوور بکەوێتەوە.

لێی پرسین: بۆ لای چۆڵ ناکا، یانی ئەوەندە چکۆلە و منداڵە؟

وتیان: نەخێر، ئەو برایەکی تری هەبوو بە ناوی یۆسف؛ جارێکیان کەوتە تەکمان [بۆ دەرو دەشت] ئێمە ئەومان بە دیار کەلو پەلەوە جێ هێشت و خۆمان چووین غار غارێن بکەین؛ تا هاتینەوە گورگ خواردبووی!

یۆسف لە دڵەوە هەندێ پێکەنی، بەڵام هیچی نەدرکاند؛ گەلێك بە تاسەی بنیامینی برای بوو.

خوا مەیلی لێبوو جارێکی تر یەعقووب بخاتە بەر هەڵسەنگاندنەوە یۆسف فەرمانی دا بارو بنەیان بارکەن و پێشی وتن: ئەو برا باوکییەشتان

بهێنن بۆ لای من. نەیهێنن ئیتر ئازۆخەتان بەرناکەوێ!

راشی سپارد ئەو پارەی لێیان سندرابوو -بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن- بخرێتەوە ناو دەفرەکانیانەوە!

## گفتوگۆی یەعقووب و کوڕانی

کوڕان گەیشتنەوە لای باوکیان و هەموو شتێکیان بۆ گێڕایەوە. پێیانوت: ئەو برایەمان لەگەڵ بنێرە، ئەگینا هیچمان لە فەرمانڕەوا دەسگیر نابێ. داخوازی [رێدانی] بنیامینیان لە یەعقووب کرد و وتیان: «ئێمە خۆمان ئاگاداریی لێ دەکەین».[1]

یەعقووب وڵامی دانەوە: «دەجا، هەروەك ئەوجار بۆ براکەی بڕوام پێکردن، ئێستەش بۆ ئاگاداریی لە خۆی بڕواتان پێبکەم!؟»[2] کێشەکەی یۆسفتان لەبیر چووەتەوە؟: چۆنتان ئاگاداریی لە یۆسف کرد، لە بینیامینشی هەر وادەکەن!؟

«چاکترین پارێزەر خوایە، خۆی لە هەموو دڵسۆزان دڵسۆزترە».[3] کاتێ پارەکەیان لە ناو بارەکەدا دیتەوە بەبابیان وت: ئەها فەرمانڕەوا پیاوێکی چەن جوامێرە! پارەکەی پێداوینەوە و هیچی لێ نەسەندووین!

بنیامینمان لەگەڵدا بنێرە، با بەشەکەی ئەویش وەرگرین. یەعقووب وتی: «نەء، نایخەمە تەکتان تاکوو بە شایەتی خوا بەڵێنی هێنانەوەیم نەدەنێ، قسەی ئەوە ناکەم شتێکی لە دەسەڵات بەدەرتان لێ روو بدا. ئەوان بە

---

(١) یۆسف: ٦٣. (٢) یۆسف: ٦٤.

(٣) یۆسف: ٦٤.

شایەتی خوا بەڵێنیان دایە و یەعقووبیش وتی: دە ئێستا خوا ئاگاداری وتە کانمانە».[١] پاشان پێی وتن: «جا، کوڕە کانم! هەمووتان لەیەك دەرگاوە مەچنە ژووریٚ، لە دەروازەی جیاجیاوە بچن».[٢]

## بنیامین لەلای یۆسفدا

برایان بە پێی ڕێنموونییەکەی باوکیان لە چەند دەرکەوە وەژوور کەوتن و گەیشتنە لای یۆسف.

دوای ئەوە یۆسف دیاری بە دیاری بنیامین شاد بووەوە، بردی بۆ ماڵی خۆیان. لە وێدا پێی وت: ئەمن برای تۆم و ئەوسا بنیامینیش بە تەواوی دڵنیا بوو.

یۆسف کە پاش ماوەیەکی دوور و درێژ بوو بنیامینی دەبینییەوە بیرەوەرییەکانی خۆی لە بابی و داکی و ماڵەکەیان و سەردەمی منداڵی خۆی بۆ گێڕایەوە.

یۆسف پێی خۆشبوو بنیامین لەلای خۆی دانیٚ؛ کە هەموو ڕۆژان ببینیٚ و قسەی لەگەڵ بکا و سەبارەت بە بنەماڵەکەیان شتی لیٚپرسیٚ. بەڵام بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی وا چی‌بکا! بنیامین دەبیٚ بەیانی بگەڕێتەوە بۆ کەنعان؟ چارە چییە، ئەوەتا برایانیش بە شایەتی خوا پەیمانیان بە بابیان داوە لەگەڵ خۆیانی بەنەوە!

جا، چۆن دەکریٚ یۆسف بیٚ هیچ بەڵگە و جیٚ دەستێك بنیامین لای

---

(١) یۆسف: ٦٦.     (٢) یۆسف: ٦٧.

خۆی گل بداتەوە؟ ئەگەر وابکاخەڵکی دەڵێن: عەزیز کابرایەکی کەنعانی بەبێ گوناه و تاوان لای خۆی زیندانی کردووە و ئەوەش ناحەقییەکی گەورەیە.

بەڵام یۆسف ئاوەزمەندێکی وردبین بوو [دەبوا لە پێشدا زەمینەی بۆ خۆش بکردایە].

یۆسف کاسەیەکی بەنرخی هەبوو کە ئاوی پێ دەخواردەوە. کاسەکەی خستە ناو بارەکەی بنیامین و پاشان فەرمانی بە جارچی دا، بە دەنگی بەرز بانگ لە برایانی بکا: ئێوە دزیتان کردووە!

برایان کە جاڕیان بیست، پرسیان: «بۆچی چیتان گوم کردووە؟

وتیان: کاسەکەی عەزیزمان ون کردووە، هەرکەس هێنایەوە مزگێنی، باری وشترێکە.

وتیان: سوێند بەخوا ـ وەك خۆتان دەزانن ـ ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووین لەم وڵاتەیدا بەدفەڕیی بکەین و دزیش نین.

پرسیان: باشە، ئەگەر دەرکەوت درۆ دەکەن سزای چی بێ؟

وتیان: لە ناو باری هەر کەسدا پەیدا بوو، خۆی سزا بدرێ، لە رێ دەرچوان دەبێ سزا بدرێن».(١)

کاسەکە لە ناو جل و جواڵی بنیامیندا دۆزرایەوە و برایان شەرمەزاریی رووی تێکردن ئەوسا خۆیان لێ دەرکرد و وتیان: بنیامین دزیی دەکا، چوون کاتی خۆی یۆسفی براشی هەر دەستی دزیی هەبوو!

---

(١) یۆسف: ٧٥، ٧١.

یۆسفی لێبووردە و لەسەرخۆ، ئەو تۆمەتەی بە گوێ خۆی بیست، بەڵام هەر نەهاتە زمان و هیچ تووڕەش نەبوو.

ئەمجا وتیان: ئەی عەزیز ئەم کوڕە باوکێکی زۆر پیری هەیە، با خۆی بڕواتەوە لە باتی ئەو یەکێ لە ئێمە گل بدەوە،

ئەزانین تۆ لە ڕیزەی چاکەکارانی.

وتی: «پەنا بەخوا! ئەگەر جگە لەو کەسەی ماڵی خۆمان لەلای دۆزیوەتەوە کەسێکی تر گل بدەینەوە، ئەگەر وابکەین لە ستەمکارانین».(١)

سەرەنجام، بنیامین بەو جۆرە لەلای یۆسف مایەوە و برایان هەموو خۆشحاڵ بوون.

لە ڕاستیدا یۆسف زۆر لەمێژ بوو بە تەنیا دەژیا و لە بنەماڵەی خۆی کەسی نەدیبوو.

ئێستە کە خوا بنیامینی بۆ گەیاندبوو، ناهەقی نەبوو نەهێڵێ بڕوا، هەر تەماشایکا و بیدوێنێ! ئایا مانەوەی برا لەلای برا دەبێتە بەدفەڕیی؟ هەرگیزای هەرگیز!

## بەرەولای یەعقووب

برایان لە دوو دڵی دا بوون کە چۆن بچنەوە بۆ لای باوکیان؟! لە وتو ویرەی ئەوەدا بوون چی پێ بڵێن؟! دوێنێ بو یۆسف تالاویان دایە دەرخوارد و ئەمڕۆش بۆ بنیامین دیقکوژی کەن!

---

(١) یۆسف: ٧٩.

براگەورەکەیان هەر ئامادە نەبوو بێتەوە بۆلای یەعقووب؛ بە برایانی وت: «ئێوە بچنەوە بۆ لای باوکتان و بڵێن: بابە گیان! کوڕەکەت دزیی کردووە؛ ئێمەش هەڕیاران لەسەر ئەوە داکە ئاگامان لێی هەبوو، خۆ غەیبمان نەدەزانی». (١)

کاتێ یەعقووب چۆنیەتی ڕووداوەکەی بیست، بۆی دەرکەوت کە دەستی خوای تیایە و مەبەستی پەروەرندە، تاقیکردنەوەی ئەوە.

دوێنێ خەمی یۆسف وای لێکرد و ئەمڕۆش هی بنیامینی بێتەسەرا! دوو داخی بە جارێ ناچێتە سەر دڵ، خوا گرفتاری داخی دوو کوڕی ناکا. پەروەرێن سۆی دوو ڕۆڵەی چەشنی یۆسف و بنیامینی نابا بە دڵەوە.

بێ‌شك ئەو کێشەیە دەستی نهێنی (٢) خوای تێدایە. بێ‌گومان ڕازێکی خوایی لە ژێر سەرا شاراوەتەوە. خوا هەمیشە خەریکی تاقیکردنەوەی بەندەکانیەتی. دوایی شادییان ئەخاتە دڵ و بە شێوازی جۆراو جۆر نێعمەتیان پێ دەبەخشێ.

وترا، کە کوڕە گەورەکەشی هەر لە میسر مایەوە و ئامادە نەبوو بێتەوە بۆ کەنعان. یەعقوبیش تا ئەم بڕگەیە دوو پەژارەی دڵتەزێن سەری لێدابوو. بڵێی سێهەمین پەژارەش ڕووی لێ بدا و لێی بێتە داخی سەرداخان!؟

نەء؛ شتی وا نەگونجاوە. چوون یەعقووب بە دڵنیاییەوە دەبێژێ: «بەڵکوو خوا گشتیان بێنێتەوە بۆلای من؛ خوا خۆی ئاگادار و لەکار زانە». (٣)

---

(١) یۆسف: ٨١. (٢) نهێنی: نادیار.

(٣) یۆسف: ٨٣.

## نهێنی ئاشکرا دەبێ

ئەوەش لە بەرچاو بگرین کە یەعقوبیش بنیادەمێك بوو وەکوو هەموو ئادەمیزادان؛ دڵیشی هەر لە گۆشت بوو نەك لە بەرد. لەو رووەوە بە کەوتنەوە بیری یۆسف، زامی ئەکولایەوە و «ئەی داخەکەم یۆسف! ببووە ویردی زمانی».(١)

کوڕانی لۆمەیان دەکرد و پێیانئەوت: شەو و رۆژ هەر یۆسف یۆسف کارت بێ هەتا دەمری!

لە جوابدا ئەیوت: «من گلەیی و دڵمەندیی خۆم بۆ خوا دەرئەبڕم، من زۆر شت لە خواوە دەزانم ئێوە لێی بێ ئاگان».(٢)

یەعقووب دەیزانی هیوا بڕاوی کفرە، ئەو ئومێدێکی یەکجار بەهێزی بە خوا هەبوو.

پاش ماوەیەك کوڕەکانی هەناردەوە بۆ میسر کە سۆراخی یۆسف و بنیامین بکەن و لە هەوڵ و تێکۆشاندا بن. لێی دەخواستن هەرگیز لە رەحمەتی خوا نائومێد نەبن و بۆ جاری سێهەمیش هەناردنیەوە بۆ میسر.

کوڕان چوونەوە بۆ لای یۆسف؛ سەبارەت بە تەنگو چەڵەمە و داماویی خۆیان دەردە دڵیان بۆ کرد و لێی پاڕانەوە پیاوەتییان لەگەڵ بکا.

لەم بڕگەیەدا پەرۆشی و خۆشەویستی، وەها تەنگیان بە یۆسف هەڵچنیبوو، خۆی بۆ نەدەگیرا. [لەدڵەوە وتو ویرەی دەکرد]: کوڕانی بابم،

(١) یۆسف: ٨٤.    (٢) یۆسف: ٨٦.

کە کوڕانی پێغەمبەرانن، لە دەستی هەژاریی و گرفتاریی خۆیان دادیان هێناوەتە لای یەکێ لە پاشایان! تاکەی خۆمیان پێ ئاشکرا نەکەم؟ هەتاکەی ئاوا چاودێری حاڵ و باریان بم و باوکم نەبینم؟

ئەمجا ئیتر دڵی پڕ بوو و لێی پرسین: «چاك دەزانن لەو سەردەمەدا کە نەزان بوون چیتان بەسەر یۆسف و براکەی هێنا».؟[1]

برایان ئەیانزانی تاقە کەسێك ئاگای لەو رازە نییە خۆیان و یۆسفی لێبەدەر. کە وایە ئەمە هەر یۆسف خۆیەتی! پەسن هەر شایانی خوایە! بۆ یۆسف ماوە، ئەی خۆ ئەو وەختە لە ناو بیرەکەدا مرد؟

ئەڵڵا! ئەم فەرمانڕەوای میسرە یۆسفە؟

ئائەوەی بەرپرسی گەنج وماڵی وڵاتە و دەخڵو دانی بۆ دابین دەکردین؟!

ئیتر گومانیان لە دڵدا نەماکە، ئائەوەی قسەیان لەگەڵ دەکا یۆسفی کوڕی یەعقووبە!

لێیان پرسی: راستی تۆ خۆت یۆسفی؟

وتی: «بەڵێ، من یۆسفم و ئەمەش براکەمە؛ بەراستی خوا بەهرەی پێداین بێگومان هەرکە خۆپارێز و خۆڕاگر بێ، خوا پاداشی چاکەکاریی گوم ناکا.

ئەمجا وتیان: دە بەوخوایە، خوا تۆی بەرامبەر بە ئێمە سەرخست و ئێمە لە خەتاکاران بووین!»[2]

یۆسف لە پێناو ئەو کارانەی کردبوویان هیچ بەکژیاندا نەچوو، بەس پێی

(١) یۆسف: ٨٩.    (٢) یۆسف: ٩١، ٩٠.

وتـن: «بـەهیوام خـوا لێتـان بـبووریٚ، ئـەو خـۆی لە هـەموو دڵسـۆزان دڵسۆزترە».(١)

## یۆسف ئەنێریٚ بەشۆن یەعقووبدا

یۆسف گەلێك بە تاسەی یـەعقووب بـوو. چـۆنـیش دەگـونجا تـاسەی نەکردبیٚ، زۆر لە مێژ بوو یەکتریان نەدیبوو.

ئێستاش ئیدی چۆن خۆی بۆ رادەگیرا لە حاڵێکا نهێنیش درکا بوو.

خواردن و خواردنەوە ئیترچ تامێکی بۆی هەبوو، وەختیٚ باوکی لە سۆی ئەودا خواردن و خەوتنی لیٚ هەڵگیرا بوو.

شاراوە کەوتە روو و نهێنی ئاشکرا بوو؛ خـواش مـەیلی لیٚبـوو چـاوی یەعقووب رۆشنایی تیٚبکەوێتەوە.

چاوانی یەعقووب بەهۆی خەم و پەژارەی زۆر، سۆماییان(٢) داهاتبوو.

بەو بۆنەوە یۆسف بە برایانی وت: «ئەم کراسەی من ببەن بیهێنـن بـە دەم‌و چاوی باوکما؛ بینایی چاوانی دێتەوە جیٚ و ئەوکاتە هەمووتان هاوڕیٚ لەگەڵ ماڵ و منداڵ بێنەوە بۆ لام».(٣)

## یەعقووب لەلای یۆسفدا

«هەر کە کاروان بە کراسـەکـەی یـۆسـفەوە بـەرەو کـەنعان کـەوتە ڕیٚ، یەعقووب بۆنی خۆشی یۆسفی بیست و وتی: من بێتی یۆسفم بە روودا دیٚ!

---

(١) یۆسف: ٩٢.

(٢) سۆما داهاتن: کوێر بوون.

(٣) یۆسف: ٩٣.

لە جوابدا وتیان: بە خوا تۆ هەر لەسەر رێ هەڵەکردنەکەی جارانی».[١]

بەڵام یەعقووب مرۆیەکی راستوێژ بوو. «کاتێ مزگێنیدەر گەیشتە بەرەوە؛ کراسەکەی خستە سەر دەمو چاوی و خێرا چاوانی چاك بوونەوە. ئەمجا وتی: ئا، پێم نەوتن: ئەوەی من لە خواوە دەیزانم، ئێوە نایزانن!؟»[٢]

منداڵانی وتیان: «بابە! بەخوا ئێمە لە رێ ترازاوین، لە پەروەرێنت وەپاڕێ لێمان خۆش ببێ، وتی: لە پەروەرندەم داوا دەکەم لێتان ببووڕێ، هەر خۆی خەتا بەخش و زۆر دڵسۆزە».[٣]

وەختێ یەعقووب گەیشتە میسر، یۆسف هات بە پیرییەوە شادیی و خۆشی کاتی روو بە روو بوونیان هەر لە گێڕانەوە نایە. ئەو رۆژە رۆژێکی پیرۆز و لە بیر نەچوو بوو بۆ وڵاتی میسر.

یۆسف دایك و بابی لەسەر تەخت داناو تێکڕا رێزو حورمەتیان لە ئاستی یۆسف دەربڕی.

یۆسف وتی: «ئەمە خەوەکەی زوومە، کە پەروەرندەم سەرەنجام هێنایە دی».[٤]

«من یازدە ئەستێرە و رۆژ و مانگم لە خەوا بینی کە سەرم لێ دەخەوێنن».[٥] ئەوسا پەسنی خوای بەو جۆرەی شایان بوو کرد و سپاسی فراوانی لە پێناو نێعمەتەکانیا بەجێ هێنا.

یەعقووب و بنەماڵەکەی ماوەی چەند ساڵان لە میسر مانەوە و خۆی و

(١) یۆسف: ٩٥، ٩٤.
(٢) یۆسف: ٩٦.
(٣) یۆسف: ٩٧، ٩٦.
(٤) یۆسف: ١٠٠.
(٥) یۆسف: ٤.

خێزانی هەر لەوێ کوچی دواییان کرد.

## پاشینەی پڕ خێر

فەرمانڕەوایی میسر بە هەموو هێز و شکۆیەوە نەیتوانی یۆسف لە یادی هەمیشەیی خوا بکا و دڵ و دەروونی بگۆڕێ، بەڵکوو هەروا لێبڕاوانە ئەرکی بەندایەتی جێ بەجێ دەکرد و شەرمی خوای بەسەردا زاڵ بوو.

قانوون و دەستووری پەروەرێنی بەرێوە دەبرد و فەرمانەکانی بە رێك و پێکی ئەهێنایە جێ.

ماڵ و ملکی ئەوەندە لا گرنگ نەبوو؛ بە شتێکی زۆر کەم بایەخی لە قەڵەم دەدا. پێی خۆش نەبوو، وەکوو پاشایەك بمرێ و لەگەڵ پاشایانی جیهان حەشر بکرێ، بەڵکوو بە ئاوات بوو وەك بەندەیەکی ئاسایی لە دنیا دەرچێ و لەگەڵ پیاوچاکان یەکانگیر ببێ.

نزای لە خوا ئەوەبوو کە: «پەروەندەی من! تۆ دارایی و دەسەڵاتت پێ دام و لێکدانەوەی خەویشت فێر کردم. بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی! گەورەی هەردوو جیهانی من هەر خۆتی بە باوەڕێکی راستەقینەوە بممرێنە و بمخە ریزی پیاو چاکانەوە».(١)

خوا بە باوەڕی شایانەوە مراندی و گەیاندیەوە بە یەعقووب و ئیسحاق و ئیبراهیمی باب و باپیری.

---

(١) یوسف: ١٠١.

# پاپۆڕی (کەشتی) نوح

## پاش ئادەم

خوا بەرەکەتی بە تۆرەمەی ئادەم دا و ژنان و پیاوانێکی زۆریان لێ کەوتەوە. بە هەمولایەکا بڵاوەیان کرد و پەرەیان سەند. بەجۆرێکی وا ئەگەر ئادەم خۆی بهاتایەوە سەر دنیا و بەرەی خۆی بدیاییەوە نەیدەناسین. ئەگەر پێی بوترایە: ئادەم! ئەمانە هەموو فرزەندی تۆن، تووشی سەرسووڕمانێکی زۆر دەبوو، و ئەیوت: گەورەیی هەر شایانی خوایە! ئائەمانە گشتیان فرزەندو نەوەی منن!؟

منداڵانی ئادەم شار و دێیەکی زۆریان بنەڕەتناوماڵانی لە ژمارە بەدەریان تیادا کردەوە. دەسیان دایە کێڵانی زەوی. تۆویان تیاداچاند و لە پەنای بەرهەمەکانی زەویدا ژیانیان ئەدایە سەر.

مەردم بە گشتی پەیڕەوی ئایینی ئادەمی بابیان بوون، بەندەیی خوایان دەکرد و هاوبەشیان بۆ دانەدەنا! ئادەمیزاد هەمو هاوباوەڕ بوون؛ باوکیان ئادەم و پەروەرندەیان خوا بوو.

## بەخیلی شەیتان

بەڵام جا، شەیتان و دارو دەستەی شتی وا چۆن قەبووڵ دەکەن؟ چۆن دەتوانن دان بە خۆدا بگرن ئادەمیزاد تا هەتایە شوێن کەوتووی یاساو و بەرنامەی خوا بن و ئەوان بێدەنگ دانیشن؟ مرۆ بۆ هەمیشە گەلێکی هاو باوەڕ بن و بەرهەڵستی یەکتر نەوەستن؟ کاری وا هەرنابێ و سەرناگرێ!

بەرەی ئادەم روو لە بەهەشتی خوا نێن و شەیتان و دارو دەستەی دۆزەخ چاوە رێیان بێ!

بێدەنگی لە پێناو کەین و بەینی وەهادا نەگونجاوە!

شەیتان ئامادە نەبوو سەر بۆ ئادەم بخەوێنێ و خوا لە رەحمەتی خۆی بێ‌وەری کرد. جا وا بوو کام ئەقڵ ئەیگرێ تۆڵە لە منداڵانی ئادەم نەکاتەوە و لەگەڵ خۆ نەیانباتە ناو ئاگرەوە؟! ئاشکرایە شتی وا هەر جێی باوەڕ نییە.

## پیلانی شەیتان

شەیتان لێبڕا تۆرەمەی ئادەم لەسەر بتپەرستی دڵگەرمکا، تا لە باتی ئارامشی بەهەشت، بەشیان بۆ هەمیشە ئاگری دۆزەخ بێ.

شەیتان لەوەش ئاگادار بوو کە [لەوانەیە] خوا لە هەموو گوناهێکی ئادەمیزاد ببوورێ، هاوبەش(١) بۆ دانانی لێ‌بەدەر. هەر بەو بۆنەوە لێبڕا بیانخاتە سەر رێی هاوبەش بۆ دانان تا بەهەشتی خوا بە چاو نەبینن.

---

(١) هاوبەش: هاریکار، شەریك.

بەڵام بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی وا دەبێ چ بکا، ئەوەتا مەردم هەموو خەریکی بەندایەتی خوان؟

دیارە ئەگەر راستەوخۆ بە مەردم بڵێ وەرن لە باتی خوا بت بپەرستن، بەرهەڵستی ئەوەستن و لێی هەڵدەچن. ئەوسا دەڵێن: پەنامان بە خوا، هاریکار بۆ پەروەرندەمان دانێین و بەندایەتی بت بکەین؟ [ئێمە چۆن بە گوێی تۆ دەکەین؟] تۆ شەیتانی پیسی قار لێگیراوی!

## فێڵی شەیتان

شەیتان [دوای لێکۆڵینەوە] سەرەنجام دەرکەیەکی دۆزییەوە کە لەوێوە خۆی بگەیەنێ بە گەورە پیاوانی ناو کۆمەڵ. لە رابوردوا گەورە پیاوانێکی لە خوا ترس ببوون، کە شەوو رۆژ لە یادی خوا و تێکۆشاندا بوون، بۆ بە جێهێنانی رەزامەندیی پەروەرندەیان.

ئەوان ئەوینی خوایان لەدڵدا بوو. خواش ئەوانی خۆش دەویست و بە هانایانەوە بوو. خەڵکیش هەر خۆشیان ئەویستن و بەچاوی مەزن و پایە بەرز تەماشایان دەکردن. شەیتانیش ئەمانەی زۆر چاك دەزانی.

ئەو گەورە پیاوانە مردن و چوونە پەنای رەحمەتی خواوە.

شەیتان کە دەچووە ناو دڵی خەڵکی، باسی ئەو پایەبەرزانەی ئەهێنایە ئاراوە و لێی دەپرسین: ئەوە فڵانکەس و فیسارکەس لە ناو ئێوەدا چۆن کەسانێك بوون؟ ئەوترا: ئەڵڵا! بەراستی پیاوی خوا و لە نزیکانی خواوەن بوون! کاتێ نزایان دەکرد لێی وەردەگرتن و هەر داخوازێکیشیان هەبوایە بۆی جێ‌بەجێ دەکردن.

## وێنەی پیاوچاکان

شەیتان پرسی: باشە ئێوە لە پەژارەیاندا هەن؟

وتیان: زۆر زۆر

پرسی: ئەی چەندە بە تاسەیانن؟

وتیان: هەر مەپرسە!

وتی: جا، کەوایە بۆ هەموو رۆژێ تەماشایان ناکەن؟

پرسیان: جا لە کوێ، مەگەر نەمردوون؟

وتی: شتێکی ئاسانە! وێنەکانیان بکێشن و هەموو بەیانییەك تێر تەماشایان کەن.

مەردم لەو راوێژەی شەیتان تووشی سەرسامی بوون. ئەوسا وێنەی پیاوچاکانیان کێشا و هەموو رۆژێك وێرای تەماشا پەسنیشیان دەکردن.

## لە وێنەوە بۆ پەیکەر

وردە وردە لە وێنەوە گەیشتن بە پەیکەر. [واتا: لە باتی وێنە] پەیکەرێکی زۆریان بۆ ئەو پیاوە چاکانە دروست کرد و لە ناو ماڵ و مزگەوتانا دایان مەرزاندن. بەڵام هێشتا هەر خەریکی پەرستنی خوا بوون و هاوبەشیان بۆ نەدەناسی.

ئەیانزانی ئەو پەیکەرانە لەبەرد ساز دراون. نەقازانجێك دەگەینن، نە زیانێك. رۆزی و بژیویشیان لەدەسدا نییە؛ بەڵام چوون هی پیاوچاکان بوون بە پیرۆز و مەزنیان لە قەڵەم دەدان.

ژمارەی پەیکەرەکان بەرە بەرە زیاتر بوون و لە پێشچاوی خەڵکی گرنگتر و پیرۆزتریش بوون. واتا، هەر پیاو چاکێك کۆچی دوایی دەکرد، پەیکەرێکیان بۆ ساز ئەدا و بە ناوی خۆیەوە ناویان دەنا.

## لە پەیکەرەوە بۆ بت (هەیکەل)

مەردمی ئەو سەردەمانە کەم کەم تێدا چوون. منداڵانیان باوکانی خۆیان دیبوو، کە چۆن لە بەر دەم ئەو پەیکەرانەدا ملیان کز دەکرد و چەند بە گەورە و پیرۆزیان دەزانین. ماچیان ئەکردن؛ بەرامبەریان ئەوەستان و رازو نیازیان لەگەڵ دەکردن.

ئەنجا ئەم بەرە، پایەك لە باوکانیان ئەولاتر چوون و کەوتنە سوژدە لێبردنیان؛ پاشان دەس وە دامان بوون و گاو گەردوون بۆ کردنیان.

لەگەڵ تێپەرینی زەماندا ئەم بتانە بوون بە پەرستوو. واتا: مەردم چۆن لە رابردوا خوایان ئەپرست [هەرواش] دەسیان دایە پەرستنی ئەوانەوە.

ژمارەی پەرستووەکانیش لە ناو کۆمەڵدا زۆرتر بوون: ئەوە «وَدّ»ە؛ ئەوە «سُواع»ە، ئائەمە «یَغوث»ە و ئەوە «یعوقَ»ە و ئەوەی‌تر «نَسْر»ە.

## قاری خوا

[هەر لەسەر ئەو لە رێ لادانە] خوا قارێکی توندو تووشی لەو خەڵکە گرت و رەحمەتی خۆی لێگرتنەوە. چۆنیان قار لێ نەگرێ و لە رەحمەت بێ بەشیان نەکا؟

بۆچی خوا بۆ لە رێ دەرچوون دروستی کردون و بژیوی بۆ بەرهەم

هێناون؟

لەسەر عەرزی خوادا بژین و لە خوا یاخی بین؟

لە چاکەی جۆراو جۆری پەروەرێنیان کەڵك وەرگرن و هاریکاری بۆ دروست کەن؟

ئەمە ستەمێکی زۆر گەورەیە! نارەواییەکی گەلێك ناشیرینە!

خوا ئەو مەردمەی خستە بەر قاری خۆی و بارانی لێگرتنەوە، تووشی تەنگ و چەڵەمەی کردن و کشتو کاڵ و زاو زێیان کەمەوە بوو.

## پێغەمبەر

خوا حەزی کرد پیاوێك لە خۆیان راسپێرێ کە قسەیان لەگەڵ بکا و راستەڕێیان پێ نیشاندا.

دیارە شێوازی کاری خوا وا نییە کە لەگەڵ تاقە تاقەی ئادەمیزاد بکەوێتە گفتوگۆ و بڵێ: تۆ ئەم کارە ئەنجام بدە و ئەوەیان مەکە؛ تەنانەت فەرمانڕەوایانیش لەگەڵ تاکە تاکەی مەردم قسە ناکەن. ناچن بۆ لای دانە دانەیان بڵێن: فڵانکەس! تۆ ئاوا بکە و ئاوا مەکە. کەچی خۆشیان هەر مرۆیەکن وەکوو هەموو مرۆی سەرزەوی و هەمووکەسیش دەتوانێ بیانبینێ و قسەیان ببیستێ.

بەڵام ئاشکرایە بینینی خواو قسە لەگەڵ کردنی لە توانای کەسدا نییە. شتی وا بۆ هیچکەس دەست نادا، کەسێك نەبێ خۆی مەیلی لێ بێ و لە کاتێکا نەبێ خۆی مەیلی لێ بێ!

لەو دەمەدا خوا پێی خۆش بوو پێغەمبەرێك بنێرێ بۆ ناو مەردم، کە

قسەیان بۆ بکا و تێیانگەیەنێ.

## ئادەمیزاد؛ یان فریشتە

خوا دەیویست ئەم پێغەمبەرە ئادەمیزاد بێ. یانێ هەر یەکێك بێ لەو مەردمە، کە خۆیان بیناسن و لەوەی دەیڵێ بە باشی تێبگەن. چوون ئەگەر پێغەمبەر فریشتە بایە خەڵکی ئەیانوت: جا چۆن یەکدەکەوین؟ ئەو فریشتە و ئێمە ئادەمیزاد! ئێمە کە دەخۆین و دەخۆینەوە و دارای ماڵ و منداڵین، بەندەیی خوامان چۆن بۆ دەکرێ؟

بەڵام کاتێ پێغەمبەر هەر لە جنسی خۆیان بوو، ئەمجا پێیان دەڵێ: خۆتان دەبینن منیش دەخۆم و دەخۆمەوە؛ ژن و منالیشم هەیە و بەندایەتی خواش دەکەم؛ بۆ ئێوە چۆن ناکرێ؟ ئەگەر فریشتەبایە ئەوسا پێیان ئەوت: تۆ یەکە، نەدەزانی برسیەتی چییە، نە توونیەتی، نە هەرگیز نەخۆش دەکەوی و نە دەشمری، دەبێ شەوو رۆژ هەر خەریکی پەسنی خوا بی. ئێمەی مرۆی، دەمێ برسی و دەمێ تینوو. جار و بار نەخۆش و رێبواری رێی مەرگ، کەی دەتوانین هەمیشە لە یادی خوادا بین؟

بەڵام کە پێغەمبەر هەر لە جنسی مرۆ بوو، پێیان دەڵێ: منیش وەك ئێوە، برسیەتیی و توونیەتی دەکێشم؛ نەخۆشی و مەرگیشم لە رێدایە و یاد و پەرستنی خواش دێنمە جێ، ئێوە بۆ دەبێ نەتوانن؟

ئەوسا مەردم لە قسان دەکەون و جێ دەستی برو بیانوویان بۆ نامێنێتەوە.

## نوحی پێغەمبەر

خوا نوحی کردە راسپاردەی ناو گەلی خۆی.

لەناو گەلی نوحدا سەرمایەدار و خاوەن دەسەلاتی زۆر هەبوون؛ بەلام خوا نوحی بۆ پێغەمبەریی هەڵبژارد و بایەخی بە هیچکام لەوانە نەدا.

خوا دەیزانی کێ شایانی گەیاندنی پەیامی و هەڵگرتنی ئەمانەتەکەیەتی.

نوح، پیاوێکی چاکە کاری دڵسۆزی، ئاوەزمەند و لەسەرخۆ بوو. رێ پیشاندەرێکی هەڵسووڕاوی راست و باوەڕ پێکراو بوو. خوا ئەوی کرد بە پێغەمبەر و پێی فەرموو: «گەلەکەت بترسێنە بەر لەوەی سزایەکی سەختیان تووش ببێ».(١)

ئەوسا نوح لە ناو کۆمەڵگەیدا هەستایەوە و پێی راگەیاندن: «من بۆ ئێوە پێغەمبەرێکی جێ باوەڕم».(٢)

## هۆزەکەی چیان جواب دایەوە؟

کە نوح کاری خۆی لە ناو مەردما دەس پێکرد و وتی: من پێغەمبەرێکی راستۆکم بۆتان، هەندێ بەرهەڵستی وەستان و وتیان: ئەمە لەکەیەوە بووە بە پێغەمبەر؟ تا دوێنێ هەر کابرایەك بوو وەك ئێمە؛ ئێستا هاتووە دەڵێ: من راسپاردەی خوام بۆ لای ئێوە!

ئاواڵ و هاوتەمەنانی ئەیانوت: کوڕە خۆ نوح لە منداڵیا هاوکایەی خۆمان

---

(١) نوح: ١.    (٢) شوعەرا: ١٠٧.

بوو؛ هەموو ڕۆژێ پێکەوە هەڵئەساین و دائەنیشتین، ئەمە [نازانم] ئەم پەیامی پێغەمبەریەی کەی بۆ هات؟ ئاخۆ شەو بوو یان ڕۆژ!...

دەوڵەمەند و دەمارگرژانی کۆمەڵ وتیان: ئەمە چی بوو، خوا پیاوی نەدۆزیەوە نوح نەبێ؟ ئەم خەڵکە هەموو مردبوون؛ لەناو ئەم گشتەدا خوا کەسی بۆ پەیدا نەبوو کابرایەکی هەژار نەبێ؟

نەزان و تێنەگەیشتوو، وتیان: «کوڕە نوحیش هەر ئادەمیزادێکە وەکوو خۆتان. جا ئەگەر خوا نیازێکی وای ببوایە، فریشتەیەکی ئەهەناردە خوارەوە. ئێمە لە باب و باپیرانیشمان شتی وامان نەبیستووە!»[1]

هی وا هەبوون ئەیانوت: نوح دەیەوێ لەم ڕێگەوە بە پلەو پایە بگا و خۆی زلکا.

## نێوانی نوح و گەلەکەی

مەردم وای بۆ دەچوون کە پەرستنی بتان کارێکی بەجێ و کردەوەیەکی ئاوەزمەندانەیە. لایان وابوو ئەوی لە پەرستنی بت خۆ دەبوێرێ نەزان و ڕێ گومکردووە.

سەرو بەری قسەیان ببوو بەوە کە: باب و کاڵمان هەموو ئەم بتانەیان پەرستووە؛ چۆن دەبێ ئێمە بیرورای ئەوان وەلانێین؟

نوحیش دەیزانی بتپەرستی نیشانەی بێ ئاوەزیی و سەر لێشێواویی مەردمە. ئاگای لەوە هەبوو کە پێشینیانی ئەوان تووشی هەڵە و نەزانی

---

(١) مرئمێنوون: ٢٤.

هاتوون، ئەگینا ئادەمی، باوکی، باب و کاڵی ئەوان، بەندەی خوا بووە، نە هی بت.

هۆزی ئەو بە هۆی گێلی و سەر لێشێواویی، خێیان داوەتە پەرستنی بەرد و، لە پەرستنی خوایە کە دروستی کردوون، خۆ لادەدەن. هەر بۆیە راپەڕی و بە دەنگی بەرز بانگی کرد: گەلی من! وەرن بەندایەتی بۆ خوایەك بکەن، کە جگە لەو کەس شایانی بەندایەتی نییە، من لەو رۆژەی دەترسم کە بەڵایەکی زۆر دژوارتان بە سەرا بێت.

گەورە پیاوانی هۆزەکەی لە جوابدا وتیان: ئێمە گومانمان لەوەدا نییە، کە تۆ لە رێ ترازاوێکی ئاشکرای.

وەڵامی دانەوە: «گەلی من! لە رێ نەترازاوم؛ پێغەمبەرێکم لە لایەن راهێنەری هەموو جیهانەوە؛ پەیامی پەروەرندەرتان پێ دەگەیەنم و رێنموونیتان دەکەم، ئەوەی من لە خواوە دەیزانم ئێوە نایزانن».(١)

## شوێن کەوتوانت گشت رووتەو پووتەن

نوح گەلێکی هەوڵدا کە بەشکوو هۆزەکەی دڵیان بێتە راستە، مل لە بەندایەتی خوا نێن و دەست لە بتپەرستی هەڵگرن، بەڵام تاك و تراکێ لە وانە نەبێ، کە خەریکی کار و تەقالا بوون و بە رەنجی شان و باهووی خۆ دەژیان، کەس بڕوای پێ نەهێنا.

سەرمایەدارانی گەلەکەی فیز و دەمار رێی پێ نەدەدان پێڕەویی لە نوح

(١) ئەعراف: ٥٩.

بکەن. سەرمەستی دارایی و ماڵ و منداڵ دەرفەتی بیرکردنەوە لە پاشە ڕۆژی لێ بڕیبوون. ئەیانوت: ئێمە ماقووڵ و خاوەن سامانین و پێڕەوانی تۆ دەست و پێن.

کاتێ نۆخ بانگێشتی دەکردن، ئەیانوت: «بڕوا بە پێغەمبەریی تۆ بێنین و بینە ریزی رووتەو پووتەی شوێنکەوتووتەوە؟»(١)

تەنانەت لە نوحیان دەخواست هەژار و فەقیری دەور و بەری دەرکا. بەڵام نوح بەگوێی نەدەکردن و لە وڵامدا ئەیوت: «من ناتوانم خاوەن باوەڕان لە خۆ دوور بخەمەوە؛ خۆ ماڵی من ماڵی پاشایان نییە؛ ئەمن وریاکەرەوەیەکی ئاشکرام و هیچی تر».(٢)

نوح دەیبینی ئەو فەقیرانە چینێکی باوەڕمەندی دڵپاکن. تۆراندنیان قاری خوا و تێکشکانی لە دوایە. بەو بۆنەوە لێی دەپرسین: «باشە خزمینە! ئینجا کێ لە دەستی خوام رزگار دەکا، ئەگەر ئەوانەم دەرکرد؟»(٣)

## بەڵگەی داراو دەوڵەمەندان

داراو دەوڵمەندان ئەیانوت: ئەو بیر و باوەڕەی نوح خەڵکی بۆ بانگەشە دەکا، نە راستە و نە بەهرەیەکیشی تیا دایە.

بوچی؟

بۆ ئەوە ئێمە خۆمان لە کێبەرکێ و خۆ گەیاندن بە هەر چەشنە خێر و قازانجێکا راهاتووین و هەمیشە لە پێشەوەین ئەوەتا خۆشترین خۆراك ئێمە

(١) شوعەرا: ١١١.
(٢) شوعەرا: ١١٥، ١١٤.
(٣) هوود: ٣٠.

دەیخۆین و جوانترین جل و بەرگیش لە بەر ئێمەدایە و مەردمیش لە هەموو کارێکا چاولێکەری ئێمە بون. گومانمان لەوەدا نییە، کە خێر لەم ولاتەدا خۆی لە ئێمە نابوێرێ و بە هەڵەدا ناچێ.

ئەگەر ئەم ئایینە شتێکی تیادا بەسەر بوایە، بەر لەوە خۆی بەو هەژار و فەقیرانە بگەیەنێ، خۆی بە ئێمە دەگەیاند.

## بانگەشەی نوح

نوح بانگەشەی هۆزەکەی کردو دەستی دایە تێگەیاندن و ڕێنموونیان و پێی وتن: «هۆزی من! ئەمن بۆ ئێوە وریاکەرەوەیەکی ئاشکرام! وەرن بەندایەتی خوا بەجێ بێنن. شەرمی خوا بتانگرێ و بە گوێم کەن. خوا گوناهتان دەبەخشێ و تا ماوەی دیاریی کراو ئەتان هێڵێتەوە کە خواش ئاکامی هێنان ئیتر دواخستنێك لە کارا نامێنێ، خوزگە ئەمەتان بزانیایە!»(١)

خوا وەشت و واری لێ گرتنەوە. بەر قاری خۆی خستن و کشتوکاڵ و تۆرەمەی تووشی کەم و کوورپی کردن.

پاشان نوح پێی ڕاگەیاندن: ئەی گەلی من! ئەگەر باوەڕ بێنن خوا لێتان خۆش دەبێ و لەم تەنگانەیەتان ڕزگار دەکا. وەشت و وارتان بەسەرا دەبارێنێ و پیت بە تۆرەمەتان و بژیوتان ئەداتەوە.

لێی دەپرسین: بۆ ئێوە خوا ناناسن؟! دەور و بەری خۆتان زۆری نیشانەی خوا تیادایە؛ بۆچی سەرنجیان نادەن؟ تەماشای ئاسمان و زەوی بۆ ناکەن؟

(١) نوح: ۴، ۲.

ئەی لە هاتن و چوونی مانگ و رۆژ هیچ تێ نافکرێن؟!

ئەو ئاسمانانە کێ دایهێناون؛ کە مانگەشەوی وەك دیاردەیەکی[1] تیشکدەرەوە و هەتاوی وەك چرایەك دامەرزاندووە؟ یان ئێوە خۆتان کێ دروستی کردوون و زەوی بۆ راخستوون؟

بەڵام گەلی نوح نەهاتنە سەر ئەقڵ و هەر باوەڕیان نەهێنا! تەنانەت وەختێ نوح بۆ بەندایەتی خوا بانگێشتی دەکردن، پەنجەیان ئەکرد بە کونی گوێچکەیانا، با وتەکانیان گوێ لێ نەبێ!

جاکەسێ نەبیستێ چۆن تێدەگا؟ ئەوەش کە خوازیاری بیستن نەبی کەی دەبیستێ؟

## نزای نوح

نوح تەقالایەکی فراوانی داو ماوەیەکی یەکجار دوور و درێژ سەرقاڵی بانگەشەی گەلەکەی بوو. واتا: بە درێژایی نۆسەد و پەنجا ساڵ، لەو رێگەیەدا خەریکی زەرپ و چەنگ بوو، کەچی ئەو گەلەی هەر ملیان بە راستیدا نەکرد و نەیانکرد.

ئامادە نەبوون دەست لە بەندایەتی بتان هەڵگرن و بەرەو پێشگای خوا بگەڕێنەوە.

ئیتر نوح تاکەی دانی بە خۆدا بگرتایە؟ تاکەی چاودێری بەدفەڕیی و گەندەکاریی سەرزەوی بایە؟

---

(١) دیاردە: نیشانە.

تاکەنگێ تەماشاکەری پەرستنی بتان، یاکوو مەردمێك بایە، کە لە ملکی خوادا دەژیان و سوژدەیان بۆ شتێکی‌تر دەبرد؟ ئیتر چۆن قوشقی نەبایە؟ ئەوەندە ئەو لێی خایاندن لە توانای هیچکەسی‌تردا نەبوو!

نۆسەد و پەنجا ساڵ! مەزنایەتی هەر شایانی خوایە! پاشان خوا بە نوحی راگەیاند: «لە هۆزی تۆ جگە لە وانەی تا ئێستا بڕوایان هێناوە، کەسی‌تر بڕوا ناهێنێ».[1]

لەملاشەوە وەختێ نوح جارێکی‌تر بانگێشتی گەلەکەی کرد، وڵامیان دایەوە: «ئەی نوح! تۆ مشت و مڕت لەیەل[2] کردین و قسەی زۆرت لەگەڵ بە زۆران داین، ئەگەر راست دەکەی ئەوەی دەڵێی بەسەرمان دێ پێمانی بنوێنە».[3]

ئەو کاتە نوح هەر یەکجاریی لێیان نائومێد بوو، رووی لە درگانەی خوا کرد و وتی: خوایە! تاقە دانەیەك لە ستەمکاران لەم سەر عەرزەدا مەهێڵەوە!

## پاپۆڕی نوح

خوا نزاکەی لە نوح قەبووڵ کرد و هاتە سەر ئەوەی هۆزەکەی لە ئاودا بخنکێنێ.

لەولاشەوە دەیویست نوح و خاوەن باوەڕان لەو راو و داوە بپارێزێ.

بۆ ئەوەش فەرمانی بە نوحدا پاپۆڕێکی گەورە دروستکا. نوح بۆ سازدانی ئەو پاپۆڕە مەزنە کەوتە تەقالا. کەهۆزەکەی سەرنجیان دا نوح

(١) هوود: ٣٦. (٢) لەیەل: لەگەل.

(٣) هوود: ٣٢.

خەریکی کارە، دەسیان دایە سەرە سەر نیان و گەمە پێ کردنی:

ئەوە خەریکی چییت جەنابی نوح؟ ئەمە لە کەیەوە بوویی بە دارتاش؟ ئێمە پێمان نەوتی: ئاوەڵایەتی ئەو خوت و خوێڕیانە مەکە؟ هەر بە گوێت نەکردین و ئەوەندە لەگەڵ دارتاش و ئاسنگەر هەستایی و دانیشتی تا سەرەنجام بوویە دارتاش! ئەم پاپۆڕە بەکوێدا هاتو چوو دەکا، نوح؟ کارو کردەوەی تۆ هەموو سەیر و سەمەرەن؟ ئاخۆ بەسەر ڕێخ و بەردا ئەڕوا، یان بە تەمووی کێوەکانا سەردەکەوێ؟ خۆ دەریا لێرە زۆر دوورە، جندۆکە ئەیبەن بە ڕێگا، یان گا دەیکێشێ!.

نوح هەموو ئەوانە و لەوانە بەولاوتریشی دەبیست و دیسان هەر بە لەسەر خۆیەوە درێژەی بەکاری دەدا! جارو بار پێی ئەوتن: «باشە گاڵتەمان پێ بکەن، ئێمەش گاڵتە بە ئێوە دەکەین، هەر وەك ئێوە پێمان دەکەن».(١)

## لافاو

بڕیارەکەی خوا هاتە دی، پەنا بە خوا! ئاسمان دایگرت لە باران! باری و هەرباری؛ بەجۆرێکی وا هەستت دەکرد ئاسمان بووە بە بێژنگ و ئاوی پێوەناوەستێ. ئاو بێ پسانەوە دەهاتە خوار؛ لافاو هەستا و بە چوار دەورا زۆری بۆ مەردم هێنا.

خوا فەرمانی بە نوح دا کە: لە هۆزی خۆت ئەوانەی باوەڕیان پێت هێناوە، لەگەڵ بنەماڵەکەت سواریانکە و لە هەر جۆرە گیاندار و

(١) هوود: ٣٨.

پەلەوەرێکیش نێرو مێیەك لەگەڵ خۆ بێنە. چوون لافاوەکە، گشتگیرە، نە مرۆ دەتوانێ خۆ لە دەستی دەرکا، نە گیان لەبەریش.

نوح چۆنی فەرمان پێ درابوو، وای کرد؛ لە ناو کەشتییەکەدا لە هۆزەکەی دەستەی خاوەن باوەڕان و لە حەیوان و باڵندەش لە هەر نەژادێ نێر و مێیەکی جێ کردەوە. پاپۆڕ، کەوتە رێ و بە ناو شەپۆلگەلی کێو ئاسادا دەری کردن.

مەردم لە هەر لاوە بە تەپۆلکە و کەژو کێودا هەڵدەبەزین و لە دەستی سزای خوا هەڵدەهاتن. بەڵام بۆ دەرچوون لە دەستی خوا پەنادەرێك جگە لە خوا لە ئارادا نەبوو.

## کوڕی نوح

نوح کوڕێکی هەبوو، کە ئاواڵ و شوێنکەوتووی، ستەمکاران بوو. کوڕەکەی لە گەمارۆی لافاوەکەدا دیت و بانگی لێکرد: کوڕی بابی! وەرە لەگەڵ ئێمە سواربە، وە دووی خوانەناسان مەکەوە. لە وڵامدا وتی: هەر ئێستا خۆ دەگەینمە لووتکەی کێوان و لە دەستی ئاو رزگار دەبم.

نوح پێی وت: ئەمڕۆ پاراستنێك لە سزای خوا نییە، مەگەر کەسێ خۆ بەزەیی پیا بێتەوە. بەشوێنیا شەپۆل کەوتە بەینیان و چووە ریزی خنکاوانەوە.

نوح بە شوێن کوڕەکەیا دڵ پەرێشان بوو. چۆنیش پەرێشان نەبێ کوڕی بوو، گرکی دڵی بوو. ئەو لە هەوڵا بوو کوڕەکەی لە ئاگری قیامەت بپارێزێ؛ کەچی لە ئاوی دنیاش بۆی نەپارێزرا.

ئاشکرایە، کەوتنە ئاگر، گەلێك بەژانترە لە کەوتنە ئاو، و سزای ئەو

دنیاش زۆر سامناکترە. بەڵام خوا بەڵێنی بە نوح دابوو بنەماڵەکەی بپارێزێ! دیارە بەڵێنی خواش جێی گومان نییە!

هەر بەو هیوایەوە نوح لێبڕا لەلای خوا ببێتە تکاکاری کوڕەکەی

## ئەو، لە بنەماڵەی تۆ نییە

«نوح لە پەروەرێنی پاڕایەوە وتی: پەروەرێنی من! کوڕەکەم لە بنەماڵەی منەو بەڵێنی تۆش راستە، تۆ لە هەموو فەرمانڕەوایەك لێزانتری».[١]

بەڵام خوا بۆ خزمایەتی ناڕوانێ، بۆ کردەوە دەڕوانێ و تکاش بۆ ئەوانەی هاوکار بۆ خوا دادەنێن قەبووڵ ناکا.

هاوبەش بۆ خوا دەنەریش لە بنەماڵەی پێغەمبەر نییە، تەنانەت ئەگەر کوڕیشی بێ.

لەو رووەوە خوا نوحی ئاگادار کرد و فەرمووی: «ئەی نوح! ئەو کوڕەت لە بنەماڵەی تۆ نییە، چوون کردەوەی ناپەسەندە؛ هەرچی شارەزاییت بە سەرا نییە لێمی داوا مەکە، ئامۆژگاریت دەکەم، نەچییە ریزی نەزانانەوە».[٢]

نوح کە داچڵەکا، پەشیمان بووە وە و وتی: پەروەردگارم! پەنات بۆ دێنم لەوەی خوازیاری شتێك لە تۆ بم نەیزانم، ئەگەر نەمبەخشی و بەزەییت پێما نەیەتەوە لە زیانبارانم.[٣]

---

(١) هوود: ٤٥.

(٢) هوود: ٤٦.

(٣) هوود: ٤٧.

## لە دوای لافاو

هەرکە فەرمانی خوا هاتەجێ و ستەمکاران چوونە ژێر ئاو، باران وەستایەوە و زەوی ئاوی هەڵمژی.

پاپۆڕ لەسەر چیای جوودی لەنگەری گرت و ئەوسا وترا: «هەی تووناو توون بن ئەوانەی وا بەدفەڕن».(١)

پاشان وترا: ئەی نوح: «بە دڵنیاییەوە دابەزە».(٢)

نوح و دانیشتوانی کەشتی ئاسوودە بەسەر وشکیدا کەوتنە رێ. خوا نەناسانی گەلی نوح تێدا چوون و نە ئاسمان پەکی بۆیان کەوت و نە زەویش. دوایی خوا پیتی بە نەتەوەی نوح بەخشی؛ بە هەموو لایەکابڵاوەیان سەند و سەرزەوییان پڕ کردەوە.

لە نەژادی نوح زۆر کۆمەڵی هاوباوەڕ و زۆر پێغەمبەر و فەرمانڕەوا کەوتنەوە.

«سڵاو بۆ نوح لە سەرانسەری دنیادا».(٣)

---

(١) هوود: ٤٤. (٢) هوود: ٤٨.

(٣) سافات: ٧٩.

# باگژەی بەهێز

## لە دوای نوح

بەڵێ، خوا پیتی بە تۆرەمەی نوح داو بەم سەرزەوییەدا پرژو بڵاو بوونەوە. یەك لەو نەتەوانەی کە لە نەژادی نوح کەوتەوە، نەتەوەی «عاد» بوو پیاوانی گەلی عاد، زۆر بە تواناو زۆردار بوون. واتا: دارای بەدەنێکی هێند پتەو و خۆڕاگر بوون، ئەتوت لە ئاسن سازدراون. کەس کۆڵی پێ نەئەدان و کۆڵیان بە گش کس دەدا. ئەوان ترسیان لەکەس نەبوو و هەموو کەسیان لێ‌دەترسا. خوا بە هەموو بارێکا نێعمەتی بەسەر گەلی عاددا رشتبوو. رانە وشتر و رانە مەڕیان، دەشت و دوڵیان داگرتبوو. مەیدانان پڕ بوون لە جەڵە[1] ئەسپی ئەوان و ماڵانیان پڕ بوون لە منداڵ.

کاتێ وشتر و مەڕیان بەرەو لەوەڕگە دەبردن، یا منداڵانیان بۆ گەشت و سەیران وەدەردەکەوتن، دیمەنی سەرنجڕاکێشیان گەلێك جێی سەرسامی بوو.

---

(١) جەڵە: دەستە، بلۆك.

وڵاتی عاد بەگشتی، وڵاتێکی جوان و ڕەنگین و ڕازاوە بە باخ و کانیاوی زۆر و زەبەند بوو.

## سپڵەیی گەلی عاد

بەڵام گەلی عاد سپاسی ئەو هەموو نێعمەتەیان هەرگیز بەجێ نەدەهێنا. تەنانەت ڕووداوی چوونە ژێر ئاوی دنیاشیان، کە باب و باپیر بۆیان گێڕابوونەوە و خۆشیان شوێنەواریان لەسەر عەرزا دەبینی لە بیر خۆ بردەوە.

هەر لە بیریان کرد، کە خوا ئەو بەڵا تاقەبڕکەرەی بۆچی بەسەر گەلی نوح هێنا.

ئەمانیش قۆڵیان لێ هەڵماڵی و شانیان کرد بە پەرستنی بتاندا؛ هەروا کە گەلی نوح کردیان.

بەدەستی خۆیان بتیان لە بەرد ئەتاشی و پاشان سوژدەیان لێ ئەبردن و بەندایەتییان دەکردن.

هانایان بۆ دەبردن؛ هێنانە جێی ئاواتیان لێ دەخواستن و گاو گەردوونیان دەکردن. یانی ڕاست؛ چوونەوە سەر ڕێبازی گەلی نوح.

ئەقڵیان پێ نەئەشکا، ڕاست و هەڵە لێکدەنەوە و دەست لە بتپەرستی هەڵگرن. لە کاری دنیادا ژیر و شارەزاو لە دینا زۆر گێل و نەزان بوون.

## دژمنایەتی عاد

زۆر و توانای نەتەوەی عاد، چ بۆ خۆیان و چ بۆ خەڵکی تریش هەر مایەی زیان و چارەڕەشی بوو. چوون نەبڕوایان بە خوا هەبوو، نە بە ڕۆژی

پەسڵانیش. ئیتر چی دەیتوانی بەر بە دڕندایەتییان بگرێ؟ چی دەیتوانێ پێشگری دژمنایەتییان بێ؟ چۆن دەس‌درێژییان بە سەر خەڵکی‌دا نەکردایە؟ لە حاڵێکا نە باڵا دەستێکیان بە چاودێری هەڵسوکەوتی خۆیان دەزانی و نە بڕواشیان بە جیهانێکی دیکە هەبوو.

سووك و ئاسان، وەك جانەوەر ناو دارستان، مەزن چووکی هەڵدەدڕی، زۆردار بێ زۆری ئەهاڕی.

هەر کاتێ رکیان ئەجویی، عەینی فیلی هەست هەڵگرتوو، لە نەچیران نەدەگەڕان، تا لە گیانیان نەکردایەن. لەوەختی شەڕدا مەزراو باخیان خاپوور دەکرد و بەرەشیان[1] تاقەبڕ دەکردن.

هەر شار و دێیەك ئەرۆیشتن بەدفەڕییان ئەگەیاندە ئەوپەڕی خۆی و دانیشتوانی، بە ئاوروویان تووشی بێ ئاورووییی دەکرد.

داماو و بێدەستان لە دڵڕەقییان دەترسان و لە تاوی دەسدرێژییان هەڵدەهاتن. توانایی و دەسەڵاتیان مایەی شەڕ بوو، بۆ خۆشیان و جیا لە خۆشیان.

چەشنی هەر ئادەمیزادێك کە نە باوەڕی بە خوا هەبێ، نە بە رۆژی تۆڵە و پاداش.

## کۆشکەکانی گەلی عاد

دەوڵەمەندانی عاد هیچ کار و کۆششێکیان نەبوو، خواردن و خەوتن و

(١) بەرە: تۆرەمە، نەسڵ.

رابواردنی لێ‌بەدەر.

هونەریان ببوو بەوە، خانوو بەرە و کۆشکی سەر لە ئاسمان‌ساوی لێ هەڵخەن و بیکەن بە مایەی دەمار نواندن و شانازیی بە سەر یەکتردا.

پووڵ و نەغدینەیان، هەر بە ئاو و گڵ و بەردا دەچوو. بە هەر زەوییەکی باهێر و هەر بەرزاییەك ئەگەیشتن کۆشکێکی بڵندیان تیادا ئەکردەوە.

خانوەکانیان بە شێوازێك ساز ئەدا و ئەڕازاندەوە، کە ژیانیان نەبڕاوەبێ و مردنێك لە ئارادا نەبێ.

لەملاوە لە پەستا کۆشکی بێ کەڵك و ناپێویست هەڵدەخران و لەولاوە مەردمی رووت و رەجاڵ بە سکی برسی رۆژ و شەویان ئەدایە سەر.

هەژار و بێدەستان کولانەیەکیان دەست نەئەکەوت تیادا بژین و زۆرێك لە خانووی دەوڵەمەندانیش پەپوو لێی دەخوێندن. هەر کەس ئەوانە و کۆشك و تالاری ئەوانەی بدیایە، بۆی دەردەکەوت بڕوایەکیان بە رۆژی سەڵا نییە.

## هوودی پێغەمبەر

خوا دەیویست پێغەمبەرێك بنێرێ بۆ ناو نەتەوەی عاد. ئاشکرایە کە خوا هەرگیز پێی خۆش نییە بەندەکانی لە رێگەی راست لادەن و گەندەکاریی لە سەرزەوی‌دا پەرە بستێنێ.

نەتەوەی عاد ئەو ئاوەزەی خوا پێی دابوون، تەرخانیان دابوو بە خواردن و خواردنەوە و هەرزەیی و کردنەوەی ماڵانەوە. چوون بیرو ئاوەزیان لە رێی رەزامەندیی خوادا نەخستبووە کار، تووشی هەڵە ببوون. لە مەیانی دنیاییدا

گەلێك شارەزاو سەردەرچوو و لە باری ئایینییەوە تا بڵێی نەزان و گێل بوون. ببوونە بەندەی بەرد و بە خۆشیان هەرنەدەزانی.

خوا دەیویست راسپاردەیەکیان بۆ بنێرێ و لەو خەوەیان راپەڕێنێ.

پەروەرێن حەزی کرد ئەو راسپاردەیە یەکێك بێ هەر لە خۆیان، کە بیناسن و جوان لە قسەی تێبگەن. ئەو پێغەمبەرە هوودی ناو بوو، کە لە ناو بنەماڵەیەکی بەرێزی گەلی عاددا چاوی بە دنیا هەڵێنا بوو، و بە باوەڕێکی ئاوەزمەندانە و راستیخوازانەوە پەروەردە ببوو.

## بانگێشتی هوود

هوود لە ناو گەلەکەیا هەستایەوە؛ بانگی کردن و پێی وتن: «گەلی من! بەندایەتی بۆ خوا بکەن، تەنیا خوا شایانی پەرستنە».[1] چۆنە ئێوە بەرد ئەپەرستن؛ بەڵام ئەو کەسەی دروستی کردوون نایپەرستن!؟

مەگەر ئەمە هەر ئەو بەردە نییە دوێنێ بە دەستی خۆتان تاشیتان؟ دە ئەمڕۆ چۆن بەندایەتییان دەکەن!؟ ئێوە خوا دروستی کردوون و هەر خۆشی رۆزیتان بۆ بەرهەم دێنێ. هەر ئەویشە پیتی بە دارایی و باخ و مەزرا و تۆرەمەتان بەخشیوە.

خوا خۆی ئێوەی هێنایە جێی گەلی نوح و هێز و توانایی بەدەنی دانێ. دیارە لە پێناو ئەو هەموو چاکەیەدا بەندەیی هەر شایانی ئەوەو، کەسی دی بۆ پەرستن ناشێ.

---

(١) ئەعراف: ٦٥.

[تۆزێ تێفکرێن] سەگی بەردرگاکەتان چوون پێشەو پەلانی دەهاونە بەر، هەرگیز بەجێتان نایەڵێ و وەك سێبەر هەر لەگەڵتانە.

ئائێستا بینراوە سەگێك خاوەنی خۆی بەجێ بێڵێ و بڕوا بە شوێن کەسێکی تردا؟

یا بینیوتانە گیانلەبەرێك ببێتە بەندەی بەرد و سوژدەی بۆ بەرێ؟ دەی ئاخۆ ئادەمیزاد لە حەیوان خوارتر بێ، یان سەرترا؟

## ولامی گەلەکەی

مەردم هەر لەفکری خواردن و خواردنەوە و هەوەسبازییدا بوون. «لە ژیانی دنیا گەلێك رازیی بوون و دڵیان پێسپاردبوو».(۱)

هەر بەو هۆیەش بە بیستنی وتەکانی هوود، دڵپەنگاو دەبوون و لە یەکتریان دەپرسی: ئەرێ هوود دەڵێ چی؟ چی دەوێ؟ خۆکەس لە قسەی تێ ناگا؟

یان، هەر پیاوێکی ساویلکەیە، یاکوو شێت بووە!

جارێکی‌تر هەوڵیدا تێیانگەیەنێ، دارا و دەوڵەمەندانی گەلەکەی وتیان: «وادەردەکەوێ یا هەر نەزانی دنیا چ باسە، یان مرۆیەکی درۆزن بی!

جوابی دانەوە: خزمان! من ساویلکە و بێئاوەز نیم. راسپاردەیەکم لەلایەن راهێنەری هەموو جیهانەوە. خەریکم پەیامی پەروەرندەتان پێ رادەگەیەنم و رێ پیشاندەرێکی جێباوەڕم بۆتان».(۲)

---

(۱) یۆنس: ۷.　　(۲) ئەعراف: ۶۸، ۶۶.

## لێزانی هوود

هوود بۆ هێنانە سەر رێی هاونشتیمانانی کەوتە تەقالاو دیسان بە لێبڕانی و لە سەرخۆییەوە قسەی بۆ کردن.

پێی وتن: خزمینە! من برای ئێوە و ئاواڵەکەی جارانتانم! بۆ خۆتان چاك نامناسن؟

بۆ وا لێم دەترسن و دووریم لێدەگرن؟ خۆ هیچ زیانێکی ماڵیتان پێ ناگەیەنم!

«برایان! ئەمن هیچ پاداشێکم لە ئێوە ناوێ، پاداشی من لەسەر خوایە و بەس».(١)

لە باوەڕ بە خوا هێنان بۆچ دەترسن؟ سوێند بەخوا، باوەڕ بە خوا کردن، یەك ڕێزە زیانی ماڵیتان پێ ناگەیەنێ! بەڵکوو بە پێچەوانەوە، خوا هەم پیت بە بژیوتان ئەدا، هەم هێز و تواناشتان زیاتر دەکا.

گەلی من! ئێوە بۆ پێغەمبەریی من، بەشتێکی سەرسوڕ هێنەر دەزانن؟ خۆ خوا جیا جیا لەگەڵ تاکە تاکەی ئێوە قسە ناکا! ڕەوشتی وا نییە رووی دەم لە تاقە تاقەی ئادەمیزاد بکا و بڵێ: تۆ ئاوا و ئاوا بکە!

بەڵکوو لە ناو هەر کۆمەڵگایەکا بە راسپاردەیەك لە خۆیان ئەسپێرێ لەگەڵیان بکەوێتە گفتوگۆ و شارەزای راستەڕێیان بکا. هەر لەو رووەوە منیشی راسپاردووە قسە لەگەڵ ئێوە بکەم و ڕێنموونیتان کەم. «بۆ پێتان

---

(١) هوود: ٢٩.

بەلاجەوییە پەیامی پەروەرندەتان بدرێ بە مرۆیەکی لە خۆتان کە وریاتان بکاتەوە؟»[(١)]

## باوەڕی هوود

گەلی عاد بۆڕیان خوارد و نەیاندەزانی جوابی هوود چۆن بدەنەوە! کە بینییان هیچیان بۆ نەماوەتەوە، وتیان: دیارە خواکانی ئێمە قاریان لێ گرتووی و فکر و ئاوەزیان گۆڕیوی! ئەها، چ زەبرێکیان پێگەیاندووی!

هوود وڵامی دانەوە: ئەو بتانە بەردن، نەقازانجێ بە کەسێك دەگەیەنن و نە زیانێکیش!

نە قسان دەکەن؛ نە دەبیستن؛ نە دەشبینن! نە خێریان لە دەس دێ و نە زیانیش.

هەر ئێوەش خۆتان نە بەهرەیەکتان لە دەستایە و نە پێچەوانەشی!

نە دەتوانن قازانجێك بە من بگەیەنن و نە زەرەرێکیش! من نە بڕوایەکم بەو پەرستوانەی ئێوە هەیە و نە لێشیان دەترسم، «بەش بەحاڵی خۆم هیچ هاوبەشێکیش بۆ خوا ناناسم».[(٢)]

لە ئێوەش هەر ترسێکم نییە، «ئەگەرچی تەواوی پیلانەکانیشتانم بۆ بخەنە گەڕ؛ چوون خۆم سپاردووە بە ئەڵڵا، کە پەروەرێنی منیش و ئێوەشە».[(٣)]

---

(١) ئەعراف: ٦٩. (٢) هوود: ٥٤.

(٣) هوود: ٥٦، ٥٥.

تەواوی بوونەوەر بە فەرمانی ئەو دەگەڕێ و تاقە گەڵایەك بێ مەیلی ئەو داناكەوێ.

## ملهوڕیی عاد

نەتەوەی عاد هەموو ئەو وتانەیان بیست و هەر ملیان بە راستیدا نەكرد.

ڕێنموونی هوود بە جاڕیانا نەچوو، و لێزانی هوود كاری تێدا نەكـردن. پێیانوت: تۆ بەڵگە و نیشانەی باوەڕ پێدەرت نییە! ئێمە لە پێنـاو ئـەم قسـە تازانەی تۆدا دەست لە خوایانی كۆنمان هەڵناگرین.

بە قسەی ئەم و ئەم دەستبەرداری ئەو خوایانە بین كە باب و كـاڵمـان پەرستوونیان؟ شتی وا چۆن دەبێ؟

هوودا كە تۆ بڕوات بە خواكانی ئێمە نییە و لێیان ناترسی؛ ئێمـەش نـە باوەڕ بەو خوایەی تۆ دەكەین، نە لێشی دەترسین! ئێمە گەلێكمان هەڕەشەو گوڕەشەی سزا لە زمانی تۆ بیست! ئـەو سـزا لە كـوێدایـە هـوودا كـەنگێ سەرهەڵدەدا؟

وڵامی دانەوە: «كاتی [سەر هەڵدانی] خوا دەیزانێ؛ من ترسێنـەرێكـی ئاشكرام و هیچیتر».(١)

وتیان باشە، ئەوا ئێمە چـاوەڕێی روودانـی ئـەو بـەڵایـەین و بـەئاواتـین ببینین.

هوود لەو نەترسییەیان سەری سوڕماو، بۆ نەزانییان دڵپەرۆش بوو.

---

(١) مولك: ٢٦.

## سزا

گەلی عاد ماوەیەك بوو بە تەمای باران بوون. هەموو رۆژێ بۆ ئاسمانیان دەڕوانی، کەچی هەورێکیان چاو نەدەکرد. ئاتاجی باران بوون و بە خۆشحاڵییەوە چاوەڕوانی بارین بوون. لە یەکێ لەو رۆژانەدا سەرنجیاندا پەڵەیەکی هەور لە هاتندایە. دڵخۆشییان پێ کەوت و قوولاندیان: ئەوە هەوری بارانە! ئائەوە هەوری بارانە! ئنجا لە خۆشیا دەسیان کرد بە هەڵپەڕین و هەرایان لە یەکتر دەکرد: هەوری باران! کوڕە هەوری باران!

بەڵام هوود تێگەیشت بەڵایان لێ نزیك بۆتەوە. پێی وتن: ئەوە هەوری رەحمەت نییە، رەشەبایەکە سزایەکی سامناکی لەگەڵدایە.

هەرواش دەرهات. واتا بایەکی بەهێز هەڵیکرد کە مردم وێنەیان نەبینیبوو، نەبیستبووشیان.

بۆرانێکی واکە دارو درەختی داپاچی و ماڵانی روخاند. گیان لەبەری کە هەڵدەگرت دووری ئەخستنەوە، جا لە عەرزی رادەخستن. رێخ و لمی بیاوانەکانی وەها فڕێ دەدا، وڵاتی کرد بە تاریکستانێك کەس هیچی بۆ چاو نەدەکرا.

ئەمجا بە تەواوی هەوڵیان لێهات. خۆیان کرد بە ماڵاندا و دەرگاکانیان پشت خست. منداڵان ئاڵان بە دایکەکانیانا. مەردم [لە ترسانا] باوەشیان کردبوو بە دیوارەکانا و هەندێك خزابوونە کون و قوژبنەوە.

منداڵ دایان لە ژێر گریانا. قیژەی ژنان بەرزەوە بوو و پیاوان کەوتنە داد و هاوار!

هەستت دەکرد کە کەسێك دەڵێ: «ئەمڕۆ پەناگایەك بۆ خۆلادان لە سزای خوا نییە».(١)

ئەو بۆرانە وێرانکەرە پاش حەو شەو و هەشت ڕۆژان وەستایەوە. لاشەی مردوان کە چەشنی قۆترمەی دارخورما بەسەر خاکدا کەوتبوون. دیمەنێکی باوەڕ پێ نەکراویان هەبوو. قەل و داڵ خەریکی خواردنی کەلاکی کوژراوان بوون و ماڵە روخاوەکان بیبوون بەجێی کوندەبوو.

هوود و خاوەن باوەڕان، بڕوایان ڕزگاری کردن، و گەلی عادیش بە هۆی ملهوڕیی و ستەمکارییان، تووناو توون بوون. بزانن کە گەلی عاد لە ئاستی پەروەرندەیان ملهوڕ بوون. هەر ئەولاتر چن ئەو عادەی گەلی هوود بوون.

(١) هوود: ٤٣.

# وشتری سەموود

## لە دوای عاد

هۆزی سەموود بوویە میراتبەری عاد، هەرواکە عاد، ببوون بە میراتبەری گەلی نوح.

بەڵێ، سەموود بوو بە جێگاداری عاد، وەکوو چۆن عاد، ببووە جێگاداری نەتەوەی نوح.

نیشتمانی سەموودیش هەروا جوان و رازاوە بوو. پڕ بوو لە گوڵ و گیاو کانیاو و مەزرا و باخگەلێك، کە چۆم و جۆگەلەیان بە بەردا دەرۆیشت.

گەلی سەمووددیش بۆ هەڵخستنی کۆشك و ماڵ و بەرهەم هێنانی باخ و مەزرا، شانیان ئەدا لە شانی عاد و لە باری ئاوەز و پیشەسازییەوە لەوانیش پێشکەوتووتر و لە بەرتر بوون. کێوەکانیان شەق ئەکرد و خانوو بەرەی خۆش و دڵگێریان تیادا ساز ئەدان و بە تەمووی بەردەوە نەخش و نگاری هونەرنما و سەرنجراکێشیان هەڵدەکەند.

هونەر و ئاوەزیان بەردی رەقی وەها بۆ نەرم کرد بوون، ئەوەی خەڵکی تر

بە مۆم سازیان ئەدا، ئەوان لە بەرد دروستیان دەکرد. کاتێ دەچوویە ناو شارەکانیانەوە هەر بە تەواوی واقت وڕ دەما. کۆشکی مەزن و کێو ئاسای وات بەرچاو دەکەوت، پێت وابوو جن دروستی کردوون. گوڵی دڵگەشێنی وایان بە تەمووی دیوارەکانەوە نەخشاندبوو، هەستت دەکرد بەهار بەرهەمی هێناون.

بەراستی خوا هەم لە ئاسمان و هەم لە زەوییەوە، خێر و بێری بەسەر هۆزی سەموودا رشتبوو و دەرگای نێعمەتی جۆراو جۆری بۆ ئاواڵە کردبوون.

ئاسمان بە وەشت و وار و زەوی بەگوڵ و روەك(١) و باخ بە بەر و میوەی رەنگاو رەنگەوە دڵاوایی خۆیان بەگەلی سەموود پیشاندا بوو. خوا پێداویستی جۆراو جۆری ژیان و درێژی تەمەنی پێ بەخشیبوون.

## پێنەزانی سەموود

بەڵام هەمور ئەوانە، گەلی سموودی نەهێنایە سەر پێزانین و بەندایەتی خوای خاوەن شکۆ.

بەڵکوو بە پێچەوانەوە هەڵینان لەسەر یاخییەتی و ستەمکاریی. خوایان لە بیر بردەوە و سەرخۆشی ئەو ماڵ و سامانە بورن، کە پێیان درابوو. زوو زوو ئەیانپرسی: ئاخۆ لە ئێمە بە دەسەڵاتتر ببێ؟ هەرگیز بە دڵیانا نەدەهات رۆژێك بمرن و ئەو کۆشك و باخانەیان بەجێ بێڵن.

---

(١) روەك: هەرچی لە زەوی شین دەبێ.

لایان وا بوو، مەرگ هەرگیز رێی ناکەوێتە ناو ئەو کەژانە و ئەوانی هەر بۆ نادۆزرێتەوە!

وایـان بـیر دەکـردەوە گـەلی نـوح، لە چۆم و دۆڵا بون، بۆیە ئاو خنکاندوونی! هـۆزی عـادیش نشتەجێی دەشت و ئارانـی بـون بۆیـە تێداچوون! کەوایە ژینگەی ئەوان لە ترسی مەرگ بە دوورە.

## بەندایەتی بتان

تەنیا بە وانەوە نەوەستان، بەڵکوو دەسیان دایە تاشینی بەرد و بەندایەتی کردنیان.

ئەوانیش چەشنی هۆزی عاد و هۆزی نوح کەوتنە سوژدە بردن لە بت.

خوا گەلی سەموودی کردبوو بە فەرماندەری بەرد، کەچی گێلی و نەزانی خۆیان کردنی بە بەندەی بەرد.

خوا رێزی لێگرتن و بژیوی پاکی دانێ، بەڵام ئەوان هەم سووکایەتییان بە خۆیان کرد، هەم بە هەموو ئادەمیزاد.

«ئاشکرایە خوا بە هیچ کولۆجێ زڵم لە کەس ناکا، بەڵام مرۆ خـۆی لە خۆی دەکا».(١)

زۆر سەیر بوو! ئەکەوتنە سەر خەواندن و سوژدە بردن لە بەردێك کە بە دەستی خۆیان تاشیبوویان و تەکو جمی لێوە نەئەهات! ئایا رەوایە زۆردار بەندایەتی بێ زۆر بکا؟ یاکوو گەورە سوژدە لە ژێر دەستەی خۆی بەری؟

---

(١) یۆنس: ٤٤.

بەڵام ئەوان چوون خوایان لە بیر بردەوە خۆشیان لە بیر نەما، چوون خوای خۆیان بە هەق نەدەناسی، خواش خوار و رسوای کردن.

## سالّح

خوا مە یلی لێبوو پێغەمبەرێکیان بۆ بنێرێ، هەروا کە بۆ هۆزی نوح و هۆزی عادی هەنارد.

بێگومان خوا رازی نییە بەندەکانی رێی هەڵە بگرنە پێش. زۆریشی پێ ناحەزە ناراستی و نامرۆیی لە سەرزەویا سەرهەڵبدا. هەر لە ناو هاونشتمانانی خۆیانا سالّح ناوێك هەبوو کە لە بنەماڵەیەکی رێك و پێك بوو، و بە باوەڕێکی راستیخوازانەشەوە بارهاتبوو.

سالّح پیاوێکی خێر خوازی لە دڵ نزیکی جێی حورمەتی مەردم بوو. لە ناو کۆمەڵدا ناوبانگی چاکەی ویردی زمانان بوو. خەڵکی جار و بار لەبەر خۆوە ئەیانوت: ئەگا بە پلەو پایەیەکی بەرز و کەسایەتییەکی گەورەی لێ دەردێ.

ئەوان بە تەمابوون سالّح دەوڵەمەندێکی گەورە و پیاو ماقووڵێکی ناوداری کۆمەڵی لێ دەرێ. چاوەڕوان بوون ببێ بە خاوەن مڵك و ماشێکی زۆر و کۆشکێکی سەرنجڕاکیشی زۆر گەورە.

تەنانەت باوکیشی هەر چاوەڕێ بوو کوڕەکەی بە یارمەتی ئەو ئاوەز و وردبینییەی پووڵ و پارەیەکی زۆر کۆ بکاتەوە و لەورێگەوە ناو دەرکا.

بە سواری ئەسپ لە ماڵ وەدەر کەوێ؛ خزمەتکار بە پشت سەریەوە بن، مەردم سڵاوی لێبکەن و بڵێن: ئائەوە کوڕی فڵانکەسە! ئەویش کاتێ

دەبیسێتەوە کە خەڵکی دەبێژن: فڵانکەس پیاوێکی زۆر بەختەوەرە، چوون کورەکەی سەرمایەدارێکی گەورەیە، شاد و خۆشحاڵ بیێ.

بەڵام ویستی پەروەرندە پێچەوانەی ئەوە بوو. خوا دەیویست ساڵح بە پلەی هێژای پێغەمبەریی بگەیەنێ و بینێرێتە ناو هۆزەکەی کە لە تاریکی دەربازیانکا و بیانگەیەنێ بە رۆشنایی. کام سەر بڵندی لەوە باترە؟ کام پلە و پایە لەوە هێژاتر؟

## بانگەشەی ساڵح

ساڵح لە ناو هاونشتمانانیا راپەڕی و پێ وتن: «هۆزی من! هەر خوا بپەرستن، بێجگە لەو پەرستوویەکی ترتان نییە».(١)

دەوڵەمەندانی کۆمەڵ کات و ساتی خۆیان تەرخان دابوو بە خواردن و خواردنەوە و هەڵە و هەرزەییەوە. خەریکی پەرستنی بتان بوون و لە بت بگەڕێتەوە کەسی تریان بە شایانی پەرستن نەدەزانی. دیارە کەدەبی بانگەشەی ساڵحیان چەندە پێ سەیر بوویێ. جارێکیان تووڕە بوون و پرسیان: ئەو کابرایە کێیە؟ خزمەتکارانیان وڵامیان دانەوە: ئەوە ساڵحە.

-باشە، ئەڵێ چی؟

وتیان دەڵێ: تەنیا خوا بپەرستن؛ چوون جگە لەو کەسی دی بۆ پەرستن ناشێ. دەشبێژێ: خوا پاش مردن دەتانژینێتەوە و پاداشی چاك، یان خرابتان دەداتەوە. دەڵێ ئەمن راسپاردەی خوام، و ئەو خۆی هەناردوومی بۆ ناو

---

(١) ئەعراف: ٧٣.

گەلەکەم.

سەرمایەداران دایان لە ژێر پێکەنیناو وتیان: ئەی هەژارا ئاخر ئەو و پێغەمبەریی؟

دەجا ئەو نەکۆشکێکی هەیە؛ نە باخ و دەشت و مەزرایەك شك دەبا، پێغەمبەریی چون بۆ دەکرێ؟

## چاوەڕاوی[1] دژمنانەی سەرمایەداران

دەوڵەمەندان سەرنجیان دا هەندێ لە مەردم خەریکن بکێشرێن بە لای ساڵح دا، ئەمجا چوون ترسیان هەبوو پلە و پایەی کۆمەڵایەتییان لە دەست بێتەوە، بەو خەڵکەیان وت: «بابە! ساڵحیش هەر کابرایەکە وەکوو خۆتان. خواردنی هەر لەوانەیە ئێوە دەیخۆن و خواردنەوەشی هەروا.

ئاشکرایە شوێنکەوتنی کابرایەکی لە چەشنی خۆشتان سەر و بەری بە زیانتانە.

ئەو وادەی ئەوەتان دەداتێ کە پاش ئەوەی مردن و ئێسقانتان بوو بە خاك سەر لە نوێ زیندوو دەبنەوە؟

پەکوو! چەن دوور لە راستییە ئەو وادەی پێتان دەدرێ!

نەخێر، جیا لەم ژیانەی دنیا ژینێك لە ئارادا نییە، دەمرین و دەژین، بەڵام زیندووبوونەویەکمان نییە و نابێ.

ساڵح هیچێ‌تر نییە، درۆ هەڵبەسێك نەبێ بە زمانی خواوە، ئێمەش هیچ

---

(١) چاوەڕاو: تەبلیغات.

بڕوایەکمان پێی نییە».(١)

## بۆ چوونی ئێمە هەڵە بوو

مەردم لە ساڵح وەرگەڕان و بڕوایان پێ نەهێنا. کاتێ ئامۆژگاریی کردن و داوای لێکردن دەست لە بەندایەتی بتان هەڵگرن؛ لە جوابدا وتیان: ساڵح! تۆ بەراستی کوڕێکی چاك و لێهاتوو بووی، ئێمە بەتەمابووین پیاوێکی گەورەت لێ دەرێ و ببیە ئەعیانی ناو کۆمەڵگا. چاوەڕوان بووین وەکوو فلانکەس و فیسارەکەس دەر بی، کەچی بە هیچ دەرچووی. ئەوانەی هاوتەمەنی تۆ بوون و لە باری فکر و ئاوەزیشەوە بە پێی تۆ نەدەگەیشتن، بوون بە پیاوانێکی مەزن. ئەتۆ رێی هەژارییت گرتە بەر و [دەرکەوت] ئێمە سەبارەت بە تۆ بە هەڵەدا چوو بووین؛ هیچ ئومێدێکمان پێت نەماوە. قازانجێکت بۆ باوکی فەقیرت نەبوو! داکی داماویشت چی رەنجی لەگەڵ کێشای بە فیڕۆ چوو!

ساڵح ئەو قسانەی ئەبیست و دڵی بۆ ئەو خەڵکە پڕ دەبوو. کە جارو بار، بە لایانا تێدەپەڕی، ئەکەوتنە سرتە سرت و ئەیانوت: خوا بەزەیی بە باوکیا بێتەوە ئەم کوڕەی چاك فکری تێکچوە!

## ئامۆژگاریی ساڵح

سەرەڕای گشت ئەوانە، ساڵح بە لەسەر خۆیی و لێزانییەوە هەر خەریکی رێنمونی گەلەکەی بوو. بانگێشتی دەکردن، کە خوا بناسن. پێی

---

(١) موئمێنوون: ٣٨، ٣٣.

ئەوتن: برایانی من! ئێوە پێتان وایە بۆ هەمیشە لەم جیهانەدان؟ وا دەزانن تا هەتایە هەر لێرە دەمێننەوە؟ وا بیر دەکەنەوە ژیانی ناو ئەم کۆشك و باخانە و بناری ئەم چۆم و جۆگەلانە نەبڕاوەیە؟

بۆ هەمیشە لە میوە و بەرهەمی ئەم باخ و مەزرایە کەڵك وەردەگرن و لە ناخی کێوەکاندا دیسان ماڵان دەکەنەوە؟

نەخێر! وا نییە! شتی وا نەگونجاو و دوور لە ئاوەزە! ئەگەر وایە، باب و کاڵی ئێوە چۆن نەماون، برایان؟!

خۆ ئەوانیش کۆشکیان هەبوو؟ باخ و کانیاویان هەبوو؟ مەزرا و باخاتی خورمایان هەبوو؟ لە ناو کێواندا خانوویان لێ ساز ئەداو لە وێدا رۆژگاریان ئەدایە سەر.

بەڵام هەموو ئەوانە قەت نەیانتوانی بیانپارێزن و فریایان نەکەوتن.

سەرەنجام فریشتەی مەرگ خۆی پێ گەیاندن و بەرەو ئەو جیهانی بەڕێ کردن.

کەوایە، ئێوەش هەر دەمرن و ئەوسا خوا دەتانژینێتەوە و سەبارەت بەم هەموو نێعمەتە باس و خواستان لێدەکا.

## لە پێناوی ئەوەدا پاداشێکم ناوێ

برایان! بۆ لێم دەسڵەمێنەوە؟ بۆچی لێم دەترسن؟ خۆ نە هیچ زیانێکی ماڵیتان پێ ئەگەیەنم و نە پاداشێکیشم لێتان دەوێ.

ئەرکی من تێگەیاندنی ئێوە و راگەیاندنی پەیامەکانی پەروەرندەمە.

«من پاداشی کاری خۆم لە ئێوە ناوێ پاداشی من راهێنەری جیهان

ئەیداتەوە».(١)

برایانی من! بۆ بە گوێم ناکەن، ئەمن پەندیارێکی دڵسۆزم بۆتان؟ بۆچی شوێن قسەی کەسانێك دەکەون کە زۆر لە مەردم دەکەن وماڵیان دەخۆن؟

ئەو کەسانەی بەرەڵلایی و نامرۆیی لە سەرزەویدا پەرە پێ ئەدەن و مەردایەتییان لێ ناخێزێ!

هۆزەکەی دەمیان بوو بە تەڵەی تەقیو و قسەیەکیان بۆ کردن نەبوو.

لە ئەنجاما وتیان: بێ گومان تۆ جادووت لێکراوە [ئەگێنا] تۆش مرۆیەکی وەکوو ئێمە؛ ئەگەر راست دەکەی نیشانێك بنوێنە

## وشتری خوا

ساڵح لێی پرسن: ئێوە چۆن نیشانێکتان دەوی؟

وتیان ئەگەر تۆ راست دەکەی [پێغەمبەری] لە ناخی ئەم کەژەوە وشترێکی دوو گیانمان بۆ بێنە دەر!

خۆشیان ئاگایان لەوە هەبوو کە وشتر لە وشتر نەبێ لە شتێکی‌تر نابێ. واتا: وەکوو گیا لە زەوی شین نابێ و لە بەردیش نازێ. کەواتە گومانیان لەوەدا نەبوو کە ساڵح لەم کێشەیەدا ئەبەزێ و ئەوان سەردەکەون!

بەڵام ساڵح باوڕێکی یەکجار بەهێزی بە پەروەرندەی هەبوو، دەیزانی ئەنجامی هەرکارێک بۆ خوا زۆر ئاسانە.

بەو بۆنەوە ئەو داوای لە خوا کرد و ئەوەی ئەو خەڵکە خوازیاری بوون

(١) شوعەرا: ١٤٥.

هاتەجێ. واتا وشترێکی دوو گیان لە ناخی کێوەکەوە هاتە دەرێ و لە دواییا زاییش.

خەڵکەکە واقیان وڕما و ترساشن؛ بەڵام هەر هیچیان بڕوایان نەهێنا.

## نۆرە بپارێزن

سالح پێی‌وتن: ئائەمە وشتری خوا، واتا: نیشانەی خوایە! ئێوە داواتان لێکرد و ئەویش بە دەسە ڵاتی خوایانەی بۆی دروست کردن.

جاوایە، دەبێ رێزی بۆ دانێن: «ئازاری پێ مەگەیەنن ئەگینا هەر بەم زوانە ئاوقەی بەلایەکی سەخت دەبن».[1]

ئەم وشترە لەسەرزەوی خوادا دەلەوەڕێ؛ ئاو دەخواتەوە و بۆ خۆی دەگەڕێ. ئەرکی ئاڵف و ئاویشی لەسەر ئێوە نییە، هەم گژ وگیا فراوانە و هەم ئاویش.

ئەم وشترە نیشانەیەکی گرنگ بوو، چۆنیەتی وەدی‌هێنانیشی هەر سەرسوڕهێنەر بوو. مەڕو ماڵاتی گەلی سەموود لێی دەترسان و لێشی بێزار بوون.

کاتێ ئەهات بۆ ئاو خواردنەوە سڵیان لێ دەکردو لە ترسانا هەڵدەهاتن.

وەختێ سالح سەرنجی ئەو بارو دۆخەی دا، وتی: ئاوەکە بکەن بە نۆرە، جارێکی بۆ وشترەکە و جارێکیش بۆ مەڕو ماڵاتی ئێوە. پێشنیازەکەی قەبووڵ کرا. کە نۆرەی وشترەکە دەکەیشت، ئەڕۆیشت و ئاوی دەخواردەوە.

---

(١) ئەعراف: ٧٣.

نۆرەی مەڕو ماڵاتەکەش ئەهات، ئەوانیش هەروا.

## یاخییەتی سەموود

بەڵام هۆزی سەموود یاخی بوون و ملیان لە ملهوڕیی نا.

وتیان: بۆ دەبێ ئاژاڵی ئێمە هەموو جارێ ئاو نەخۆنەوە؟ رکیان هەستا لەو وشترە، چوون مەڕو ماڵاتیان دووریيان لێ دەگرت، ئەگەرچی ساڵح ئاگاداریی پێدابوون کە سووکایەتی بە وشترەکە نەکەن، بەڵام هەر خۆیان بۆ نەگیرا. پرسییان: کێ ئامادەیە ئەو وشترە بکوژێ؟

کابرایەك هەستایەوە وتی: من ئامادەم!

ئەمجا یەکێکی دی راپەڕی و وتی: ئەمنیش!

ئەو دوو تاوانکارە رۆیشتن و بە ئومێدی هاتنە دەرەوەی وشترەکە خۆیان داگرت.

هەرکە وەدەرکەوت: یەکەمیان بە تیر لێی دا و ئەویتریان سەری بڕی و لە گیانی کرد.

## بەڵا

وەختێ ساڵح ئاگادار بوو کە وشترەکەیان سەر بڕیوە؛ خەم دایگرت و بە پڕ دڵ پەرێشان بوو.

بە هۆزی سەموودی راگەیاند: «تا سێ رۆژیتر [بە دڵی خۆتان] لە ناو ماڵەکانتانا رایبوێرن، ئەمە وادەیەکی بڕاوەیە».(١)

---

(١) هوود: ٦٥.

لە ناو دانشتوانی شارەکەدا دەستەیەکی گەندەکاری نۆ کەسی هەبوون کە هەرگیز توخنی چاکەکاری نەدەکەوتن و پیشەیان بیووە بەدفەڕیی و نامرۆیی. ئەو نۆ پیاوە سوێندیان خوارد و وتیان: هەر ئەمشەو ساڵح و کەس و کاری دەکوژین. دوایی ئەگەر لێیان پرسین، دەڵێین: ئێمە ئاگامان لێ نییە. بەڵام خوا ساڵح و کەس و کاری [لە شەڕیان] پاراست و ئەوان پاش سێ رۆژ بەڵایان هاتە سەر.

وەك هەمیشە بەیانی لە خەو هەڵسان. بەڵام ئەمجارە لەگەڵ نرکە و شریخەی بوومەلەرزەیەکی بەهێزدا روو بە روو بوون. نرکەیەکی وا کە زاڵە ترەکی کردن و ماڵەکانی بە سەرا روخاندن.

ئەو رۆژە بو گەلی سەموود رۆژێکی یەکجار تووش بوو. مەردم هەموو تێدا چوون و وڵاتیان وێران بوو. ساڵح و خاوەن باوەڕان ئەو وڵاتە خاپوورەیان بەجێ هێشت. ئیتر مانەوەیان لەوێدا چ کەڵکێکی هەبوو؟

ساڵح لە کاتی هاتنە دەرەوەدا چاوی گێڕا هۆزەکەی هەموو مردبوون! بە زاراوەیەکی خەمینەوە وتی: «خزمینە! من پەیامی پەروەرندەم پێ گەیاندن و رێنموونی زۆریشم کردن، بەڵام ئێوە [بێباوەڕان] رێنموونیتان پێ خوش نییە».(١)

ئەمڕۆ لەو مەڵبەندەدا جگە لە کۆشکی چۆڵ و هۆڵ و بیرگەلی بەتاڵ و بێ خاوەن، چی ترت بەرچاو ناکەوێ.

شارێکی شامناك، کە نە بانگەواز کارێکی تیادایە و نە جوابدەرەوەیەکیش.

---

(١) ئەعراف: ٧٩.

لەو سەردەمەدا کە پێغەمبەر [سەلامی خوا لە خۆی و یارانی] لە ڕێگەی شامەوە بە وڵاتی سەموودا تێپەڕی، بە خاوەن باوەڕانی هاوڕێی فەرموو: بە ترس و دڵپرییەوە بچنە ناو ژینگەی ئەو کەسانە وا زلْمیان لە خۆیان کرد، نەکوو ئەوەی لەوان ڕوویدا بەسەر ئێوەش بێ.

«بزانن! کە گەلی سەموود بەرهەڵستی پەروەردگاریان وەستان هەی ئەولاتر چن گەلی سەموود».(١)

(١) هوود: ٦٨.

# بەسەرهاتی مووسا

## لەکەنعانەوە بۆ میسر

حەزرەتی یەعقووب کۆچی کرد بۆ میسر و کوڕانیشی لەگەڵیا چوون. تێکڕا ڕۆیشتن بۆ میسر؛ چوون یۆسف ببووە سەرۆك و فەرمانڕەوای ئەو وڵاتە.

بنەماڵەی یەعقووب لەکەنعاندا پیشەیان مەڕ لەوەڕاندن و حەیوان دۆشین و فرۆشتنی خوری و بەرگین بوو. لە حاڵێکا بەردەست و خزمەتکارانی دەورو بەری یۆسف لە میسرا لەوپەڕی تێر و تەسەلیدا ئەژیان.

کەوابوو، بۆ لە کەنعان دانیشتایەن؟ بۆچی نەچوایەن بۆ میسر؟ یۆسف هەناردی بە شوێن باوکی و بنەماڵەکەیا و داوای لێکردن بڕۆن بۆ لای.

یۆسف لە عەزرەتی چاوپێکەوتنی باوکی و برایانیدا نان و ئاوی لێ هەڵکەوتبوو.

هەقیشی بوو خواردن و خواردنەوە و خۆشی ژیانی لێ ببێزرێ، لە خزم و بنەماڵەی تاقەکەسێکیان لە وڵاتی میسردا نەبوو؟

کۆشك بۆ ئەو چ دەژیا، لە حاڵێکا بابی و برایانی لە کەنعان لە ماڵێکی چکۆلەدا ژیانیان ئەدایە سەر؟!

یەعقووب وکوڕانی گەیشتنە میسر؛ یۆسف چوو بە پیریاییانەوە و دیاری بە دیاریان شاد بووەوە.

دانیشتوانی میسریش بە پێشوازیی لە بنەماڵەی سەرۆك و فەرمانڕەوای دڵسۆزیان گەلێ خۆشحاڵی رووی تێ کردن.

خەڵکی میسر ئەم بنەماڵە بەڕێزەیان خۆش دەویست، چوون یۆسفیان لەبەر مەردایەتی و چاکەکاریی ناو مەردمی لا خۆشەویست بوو. یۆسفیان بە برایەکی گیانی و دڵسۆز دەزانی و یاقووبیشیان بە چاوی باوکێکی هێژا و دڵۆڤان تەماشا دەکرد.

یەعقووب بوویە گەورەو ریشسپی میسر و دانیشتوانی میسر وەکوو فرزەندی ئەو لە قەڵەم دەدران.

میسر بوو بە جێی ئارامش و حەسانەوەی یەعقووب و کوڕانی و سەرەنجام بوو بە نشتمانیشیان.

## لە دوای یۆسف

دوای ماوەیەك یەعقووب کۆچی دوایی کرد و هەم یۆسف و هەم دانیشتوانی میسری تووشی پەژارە کرد.

میسریی لە رێ و رەسمی تێژرانیدا کارێکیان کرد لات‌وابوو باوکی خۆیان مردووە! پاش بەینێکی‌تر یۆسفیش تیا چوو، و رۆژێکی پڕ لە داخ و کەسەر بۆ گەلی میسر هاتە پێشەوە.

خەم و دڵپەنگاویەکی وا رووی تێکردن کە تا ماوەیەکی تووڵانی بە کوڵ بۆی دەگریان.

مەردم خەمەکانیتریان وا لە بیر چووبوو، هەستت دەکرد پێش لەوە هیچ خەمێك سەری لێ نەداون.

یۆسفیشیان هەر لە میسردا ناو و سەرخۆشییان لە یەکتری کرد. لە خەمی یۆسفدا هەموو وەکوو یەك بەشدار بوون.

کەم تەمەنان باب و بە تەمەنان برایان لە دەس جوو بوو.

لە کاتی سەرخۆشی لە براو برازاکانی یۆسفدا پێیان وتن: بەڕێزان! زەبر و زیانی ئێوە لە مرۆدا لە هی ئێمە زیاتر نییە! ئێمە ئەمرۆ برایەکی گیانی و سەرپەرستێکی دڵسۆزو فەرمانڕەوایەکی داد پەروەرمان لە دەست دەرچووە.

ئەو کەسەی هەژار و ژێردەستی خستە ئاسایش و ناهەقی لە وڵاتدا لە ناو برد، نەیدەهێشت گەورە بچووك بچەوسێنێتەوە و زۆردار بێزۆر لەناو بەرێ.

بە هانای زۆر لێکراوانەوە بوو؛ ترساوی پەنا ئەدا و برسی تێر ئەکرد. ئەوەی راستەڕێی بە ئێمە پیشانداو بەرەو لای خوای بانگێشت کردین. ئێمەیەکە بەر لە هاتنی ئەو لە دنیایەکی حەیوانیدا بووین، نە خوامان دەناسی و نە ئاگامان لە رۆژی پەسڵان هەبوو.

ئەو بوو لە کاتی قاتی و برسییەتیدا گەیشتە فریامان. لەو سەردەمەدا کە مەردم لە وڵاتانیترا لە برسانا ئەمردن ئێمە بژیومان پێ ئەگەیشت و تێریش دەبووین.

ئێمە هەرگیز نە پاشای جوامێری خۆمان لە بیر ئەچێتەوە؛ نە ئێوە برایانی

بەڕێزی و نە بنەماڵەی هێژاشی.

ئای ئەو سەرۆکەمان لە رۆژی گەیشتنە بەرەوەی ئێوەدا چەند خۆشحاڵ بوو، ئێمەش بە شادی ئەوەوە چەند شاد بووین!

بەڕێزان! وڵات وڵاتی خۆتانە و ئێمەش هەر خزمەتکارەکانی سەردەمی ژیانی سەرۆکمانین.

## بەرەی ئیسراییل لە میسردا

ماوەیەکی درێژ خایەن، بەو شێوازە بەسەرچوو!

دانیشتوانی میسر هەر لەسەر بەڵێنیان مابون و لەگەڵ کەنعانیان بەڕێز و حورمەتەوە رەفتاریان دەکرد.

کەنعانییەکان کە بەرەی ئیسراییل [بەرەی یەعقووب]یان پێ ئەوترا، هەم دەوڵەمەند بوون، هەم بەرێز و خۆشناویش. دوای ماوەیەك بارو دۆخ گۆڕیا و بەرەی ئیسراییل بەد ئەخلاقی رووی تێکردن. دەسیان لە بانگەشەی ئایینی هەڵگرت و کەوتنە ناو گێژاوی دنیا پەرستییەوە. پێ بە پێی ئەوە مەردمیش لێیان تەواسانەوە و ئیتر بە چاوی باو باپیریان تەماشایان نەدەکردن.

کەم کەم چوونە ریزی خەڵکی ترەوە و تەنیا فەرقیان لەگەڵ مەردمی ئاسایی ناوە بنەماڵەییەکەیان بوو.

ئنجا مەردم بە ئیرەییەوە بۆ دەوڵەمەندانیان دەڕوانین و هەژارەکانیان بە هیچ و پووچ لە قەڵەم دەدان.

بە بێگانەگەلێکیان دائەنان کە لە وڵاتێکی ترەوە هاتوون و هیچ مافێکیان

بەسەر خاکی میسرەوە نییە.

لەسەر ئەو باوەڕە پێ داگر بوون کە: بەرەی ئیسراییل هەندەرانین و وڵاتی میسر، هی میسرییەکانە.

هەندێ لە دانیشتوانی میسر کەوتبوونە بیری ئەوە کە یۆسفیش هەر غەریبەیەك بووە کە لە کەنعانەوە هاتۆتە میسر و فەرمانڕەوای میسر کرپویەتی. [واتا:] ڕەوا نییە کەنعانیی ببێتە فەرمانڕەوای میسر.

تەنانەت زۆرینەی مەردم مەزنایەتی یۆسف و ئەو هەموو جوامێریی و چاکەکارییەیان لە بیر کردبوو.

## فیرعەونی میسر

فیرعەونەکان (پاشایانی میسر) کە بوون بە فەرمانڕەوای میسر، ڕکێکی لە ڕادە بەدەریان لە بەرەی ئیسراییل هەبوو.

پاشایەکی تووش و دڵڕەق چووە سەر تەختی فەرمانڕەوایی میسر، کە تۆرەمەی ئیسراییلی بە بەرەی پێغەمبەران و کەس و کاری یۆسفی پاشای میسر نەدەزانی.

تەنانەت بە ئادەمیزادیشی دانەئەنان، کە بەزەیی پیانا بێتەوە و دادوەرانە ڕەفتاریان لەگەڵ بکا.

پاشایەکی هەر یەکجار ستەمکار بوو.

لەسەر ئەو بڕوایە بوو، کە گەلی ئەو (قیبتی) شتێکن و هۆزی ئیسراییل شتێکی ترن.

قیبتی لە بەرەی پاشایانن و بۆ فەرمانڕەوایی دروست بوون. بەرەی

ئیسراییل لە نەژادی کۆیلەن[١] و هەر شایەنی بەردەستی و خزمەتکارین.

رەفتاری فیرعەون لەگەڵ تۆرەمەی ئیسراییل چەشنی رەفتار لەگەڵ گا و گۆلێکا بوو، کە مرۆیەك کاریان پێ دەکا و بژیوی رۆژانەیان ئەداتێ.

فیرعەون پاشایەکی تووشی لە خۆ دەرچوو بوو کە تاقە کەسێکی لە خۆ بەگەورەتر نەدەزانی.

دانی بە بوونی خوادا نەدەناو ئەیوت: «من خۆم پەروەرندەی مەزنی ئێوەم!»[٢]

هەوای مڵك و ماش و کۆشك و دەسەڵاتی وا دابووی لە کەلەی ئەینەڕاند کە: «مەگەر تەواوی مڵکی میسر و هەموو ئەو چۆم و جۆگەلانەی بە بەریاندا تێدەپەڕن هی من نین؟! مەگەر خۆتان نابینن؟!»[٣]

خۆی کردبوو بە جێنشینی نەمروودی پاشای بابل؛ ئەگەر بیزانیایە کەسێ، یەکێکی لەو گەورەتر لە دنیادا شك دەبا، واوەیلا بوو.

لە مەردمی دەخواست بەندایەتی بکەن و سوژدەی لێ ببەن. ئەوانیش فەرمانیان ئەهێنایە جێ. بەڵام تۆرەمەی ئیسراییل چوون بڕوایان بە خوا و پێغەمبەرانی هەبوو بە گوێیان نەدەکرد و ئەویش ئەوەندەیتر رکی لێیان دەجوی.

## سەربڕینی منداڵان

جارێکیان پەرسیارێکی[٤] قیبتی چوو بۆ لای فیرعەون و پێی راگەیاند:

---

(١) کۆیلە: بەردە.
(٢) نازیعات: ٢٤.
(٣) زوخروف: ٥١.
(٤) پەرسیار: عارف، خواناس.

لە ناو نەژادی ئیسراییلدا منداڵێك لە دایك ئەبێ و تۆ لە دەستەڵات دەخا.

ئنجا فیرعەونیش [لە ترسانا] شێتی دایە کەلەی و فەرمانی بە سەربازانی دا چی منداڵ لە ناو بەرەی ئیسراییلدا لە دایك دەبێ سەریان ببڕن.

فیرعەون کە خۆی بە پەروەردگاری مەردم دەزانی، کێی پێ خۆش بـوو ئەیکوشت و کێی پێ خۆش بوو لێی دەگەڕا.

چەشنی دەوڵەتدارێك کە بە مەیلی خۆی مەڕ سەر دەبڕێ، یاکوو ئەیان هێڵێتەوە.

پیاوانی فیرعەون بە وڵاتی میسردا بڵاوەیان کرد و خەریکی گەڕان بوون. لە هەر کوێ بیانزانییایە منالێك لە ناو نەتەوەی ئـیسراییلدا لە دایك بـووە، ئەیان هێنا و وەکوو کاوڕ لە گیانیان دەکرد.

گورگ لە ناو دارستان و مار و دووپشك لە ناو شار و دێدا دەژیان و کەس کاری پێیانەوە نەبوو، بەڵام منداڵانی بەرەی ئیسراییل لە وڵاتی فیرعەنا مافی ژیانیان نەبوو.

هەزاران منداڵ بە بەرچاوی داك و بابیانەوە سەریان لە لەش جیا کرایەوە.

هەر رۆژێ منداڵی بەرەی ئیسراییلی تیادا دەزا رۆژێکی پڕ مەینەت بوو. رۆژی پەژارە و شیوەن بوو.

بەڵێ، ئەو رۆژەی منداڵی نەژادی ئیسراییلی تیا دەزا رۆژی خەم و شین گێڕیی بوو.

[جاری وا هەبوو] لە یەك رۆژدا سەدان منداڵ سەردەبڕان؛ وەکوو چۆن لە رۆژی جەژنی قورباندا سەدان مەڕو مانگا و بەران قوربانی دەکرێن.

«فیرعەون کە لە سەرزەویدا باڵا دەست بوو، خەڵکەکەی کرد بە چـەن

دەستەوە و هەندێکی بە تەواویی چەوساندەوە؛

کوڕەکانی سەردەبڕین و ژنەکانی رادەگرتن؛ ئەوەندە لە بەدفەڕوگەندەکار بوو.(١)

## لە دایك بوونی مووسا

خوا مەیلی بوو ئەوەی فیرعەون لێی دەترسا و خۆی لێ دەپاراست بێتەدی.

لە دایک بوو، ئەو رۆڵەیە کە خوا دەیویست تاج و تەختی فیرعەون بە دەستی ئەو هەڵپێچرێ.

لە دایك بوو ئەو منداڵەی خوا دەیویست بەرەی ئیسراییل بە دەستی ئەو رزگارکا. ئەو کەسەی دەبوا مەردمی لە مەردم پەرستی دەربازکردایە و فێری خوا پەرستی کردایەن. پەیدا بوو ئەو کوڕەی ئەشیا خەڵکی لە تاریکاییەوە گەیاندایەتە رووناکی.

بەڵێ؛ بە پێچەوانەی ویستی فیرعەون و سپاو لەشکری، مووسای کوڕی عیمران لە دایك بوو. سەرەڕای چاوە چاو و گوێ تەقێی هەموو ئەوانە، تەمەنیشی گەیشت بە سێ مانگ.

## لە نیل‌دا

بەڵام دایکی مووسا لە گیانی کوڕە جوانکیلەکەی زۆر دەترسا. چۆن

---

(١) قەسەس: ٤.

نەترسایە، دژمنی منداڵان لە بەرامبەریەوە گوێقوڵاخ وەستا بوو! چۆن دەبوو نەترسایە، لە کاتێکا سەربازان لە ناو ماڵاندا دەیان منداڵیان لە ئامێزی[١] دایك دەرهێنا بوو.

دایکی بێچارە چی لە دەس ئەهات؟ ئەو کۆرپە جوانەی لە کوێ بشاردایێتەوە کە سەربازانی چاو تیژ و بۆزەن پەیان پێ نەبردایە؟

لە ئەنجاما دایکی داماو هانای بردە بەر خوا. پەروەرندە فەرمانی دایە کە: مووسا بنە ناو سندۆقێك و بیخە ناو دەریای نیلەوە.

گەورەیی هەر بۆ خوایە! جا چۆن دایکی پڕ هەست و سۆز رۆڵەی بخاتە سندۆق و بیهاوێتە نیل؟!

منداڵێك لە ناو سندۆقێکا کێ شیری بداتێ؟ یا چۆن هەناسە بدا؟!

دایکی دلۆڤان بیری لە گشت ئەوانە کردەوە؛ بەڵام پشتی بەست بە خواو بەوەی خواخستیە دڵیەوە.

مەترسی ناو ماڵیش لە هی ناو سندۆق کەمتر نەبوو!

پیاوانی چاو تیژ و بۆزەنی فیرعەون لە هەموو لایەکا هەبوون. دژمنی منداڵان وازر[٢] بوو.

سەربازان لە چاو تیژیی و بۆزەنیدا گرەویان لە قاڵاو و مێروولە ئەبردەوە.

دایکی فەقیر ئەو فەرمانەی خوا پێی دابوو بە جێی هێنا. کوڕە شیرینەکەی خستە ناو سندۆقێك و هاویشتییە نیلەوە.

---

(١) ئامێز: باوەش. (٢) وازر: وریا.

لە ئەولەوە لە دڵە راوکێدا بوو، پاشان هێدیی[1] بووەوە و پشتی بە خوا بەست.

«دایکی مووسامان تێگەیاند، شیری دەیەو و هەرکاتێ لێی دڵگران بووی بیهاوە ناو دەریاوە؛ مەترسە و خەمی مەخۆ ئێمە بۆتی دێنینەوە و ئەیکەینە یەکێ لە پێغەمبەران».[2]

## لەکۆشکی فیرعەوندا

فیرعەون لە قەراخی دەریای نیلدا دارای چەند کۆشکی جۆراو جۆر بوو. لەم کۆشکەوە ئەچوو بۆ ئەو کۆشك و سەر قاڵی سەیران و رابواردن بوو.

رۆژێکیان لە قەراخی نیلدا دانیشتبوو؛ سەرنجی رەوتی ئەو ئاوەی دەدا کە بە بەردەمیا دەرۆیشت.

لەم کاتەدا خێزانیشی لەگەڵدا بوو؛ ئەویش خەریکی پیاسەو تەماشای رەوتی ئاوەکە بوو.

هەر لەو حاڵی سەیرانەدا سندۆقێکیان دی کە شەپۆلان بە تەزرێکی وا کایەیان لەگەڵ دەکرد، پێت وابوو ماچی دەکەن.

ـ ئەو سندۆقەی دەبینی گەورەم؟

ـ سندۆق، کوا؟ لە ناو نیلدا؟ کوڕە ئەوە تەختە دارە، کەوتۆتە سەر ئاوەکە!

ـ نە گەورەم، هەر سندۆقە!

سندۆق، کە نزیك بووەوە ئەوسا مەردم وتیان: بەڵێ سندۆقە! شا،

(١) هێدی: ئارام.

(٢) قەسەس: ٧.

فەرمانی بە یەکی لە بەردەستان دا: ئائەو سندۆقەی بگرەوە. کابرا رۆیشت و هێنایە قەراخەوە!

وەختێ کرایەوە کورێکی جوانکیلەو دەم بە پێکەنینی لێ بوو. مەردم هەموو واقیان وڕما. هەر هەڵیان ئەگرت و تەماشایان دەکرد. فیرعەون خۆشی سەری سوڕما و ماق ببو پیایا.

یەکێ لە بەردەستان وتی: ئەم منداڵە لە نژادی ئیسراییلە؛ شا دەبێ سەری ببڕێ.

کاتێ شاژن بینی، خۆشەویستی نشتە دڵی. لکاندی بە سینەیەوە و ماچی کرد.

هەر خۆشی لەلای شا بووبە تکاکار بۆی و وتی: «ئەمە هۆی رووناکی چاوانی من و تۆیە. مەیکوژە؛ شایەت بەهرەیەکی بۆمان هەبێ، یاکردمان بە کوڕی خۆمان».(١)

مووسا لەو رێگەوە چووە ناو کۆشکی فیرعەون و پێچەوانەی حەزی فیرعەون و لەشکری، ژیانی لە وێدا دەست پێ کرد.

سەربازانی چاو چنۆك و بۆزەن، ئەو منداڵە ئیسراییلی نەژادەیان هەر بۆ نەناسرا.

خوا دەیویست فیرعەون [دژمنی منداڵان] ئەو مەلۆتکەیە پەروەردە بکا، با تەخت و بەختی لێکبکاتەوە.

فیرعەونی ساویلکە! سەبارەت بە مووسا چاك بە هەڵەدا چوو.

---

(١) قەسەس: ٩.

شان بە شانی خۆی هامانی وەزیری و سپا و سانیشی هەر تووشی هەڵە بوون.

«دارو دەستەی فیرعەون گرتیانەوە، تا ببێتە دژمنیان و مایەی مەینەتیان. ئاشکرایە فیرعەون و هامان و سپا و لەشکریان تووشی هەڵەیەکی گەورە هاتن». (١)

## کێ شیر بە منداڵەکە بدا؟

منداڵی تازە هاتوو و خوێن شیرین بووە مایەی گاڵتەو گەپی دانیشتوانی کۆشك و ناو ماڵی فیرعەون.

هەموان لە باوەشیان دەگرت و ماچیان دەکرد. چوون پاشا ژن بە پڕ دڵ خۆشی دەویست، ئەوانیش خۆشەویستییان بەرامبەر دەردەبڕی و گۆرانییان پیادا ئەوت.

ئیتر ژنانی ناوکۆشك و پیاوە خزمەتکارەکان چۆنیان خۆش نەویستایە؟

یەك یەك هەڵیان ئەگرت و ماچیان دەکرد؛ چوون منداڵێکی لە دڵ نزیك بوو.

خێزانی فیرعەون ناردی بە شوێن ژنێکی شیردەرا کە مەمکەی بداتێ. ژنێك هات و منداڵی نایە کۆش؛ بەڵام گریا و مەمکی نەگرت. ژنێکی تری بانگ کرد. ئەویش هات و منداڵی گرتە باوەش؛ دیسان دای لە ژێر گریانا و مەمکی ئەویشی نەگرت.

---

(١) قەسەس: ٨.

سێهەم و چوارەم و پێنجەمیش هاتن، هەرگریا و رووی لێ وەرگێڕان. زۆر سەیرە! ئەم منداڵە بۆ شیر ناخوا؟ بۆچی دەگری؟

ژنانی شیردەر زۆریان تەقالا دا شیری بدەنێ، بەڵکوو پاشاژن خۆشحاڵ کەن و خەلاتیشی لێوەرگرن، بەڵام خوا شیری شیردەرانی لێ حەرام کرد بوو. قسەی ئەم منداڵە ببووە دەنگ و باسی ناو کۆشك و کاری دانیشتوانی ماڵەوە.

ـ منداڵە تازەکەت دیوە خوشکێ؟

ـ بەڵێ دیومە، منداڵێکی زۆر جوانە!

ـ بەڵام شتێکی نائاساییە؛ وەکوو منداڵانی تر نییە! شیر هەر ناخوا.

ـ هەر ژنێ ئەیگرێتە باوەش ئەدا لە ژێر گریانا و مەمکەی ناگرێ بەستەزمان جا وا چۆن دەژی؟ بێ گومان دەمرێ.

ـ بەڵێ؛ ئەوەتا چەند رۆژی لێ گوزەراوە و شیریشی هەر نەخواردووە.

## لە باوەشی دایکیا

دایکی دلۆڤان بە خوشکی مووسای وت: ئابڕۆ کچەکەم، هەواڵێکی براکەت بزانە، لەوانەیە هێشتا زیندووبێ.

خوا بڕیاری داوە خۆی ئاگاداریی لێبکا و بیگەیەنێتەوە دەستم. خوشك چوو بە شکوو و سۆراخی براکەی بکا.

لە مەردم باسی منالێکی جوانکیلەی بیست، کە لە کۆشکی شادایە. پاشان خۆی گەیاندە کۆشك و گوێ دایە قسەی ژنان:

- ئاخۆ ئەو ژنە شیردەرەکە شاژن دەیویست؛ لە ئەسوانەوە[1] هات؟

- بەڵێ خاتوون؛ بەڵام منداڵەکە رووی لەویش وەرگێڕاو شیرەکەی نەخوارد.

- ئەی خوا! ئەم منداڵە چییەتی؟ پێم وایە ئائەمە شەشەمین ژنە، پاشاژن تاقی دەکاتەوە!

- بەڵێ، دەڵێن ئەو ژنە شیردەرێکی زۆر پاك و پوختەیە؛ هەموو منداڵێك شیری دەخوا.

خوشکی مووسا، دوای بیستنی ئەو قسانە بە زاراوەیەکی رێك و پێکەوە وتی: من هەر لەم شارەدا ژنێك دەناسم، رەنگە ئەم منداڵە مەمکەی بگرێ.

ژنێك وڵامی دایەوە: بڕوا ناکەم. ئێمە تا ئێستا شەش ژنمان تاقی کردۆتەوە؛ بەڵام شیری هیچیانی نەخواردووە.

یەکێکی‌تر وتی: دەبۆ حەوتەمیش نەدەینە بەراورد، چ زیانێکی تیایە؟

قسەکە گەیشتەوە بە ژنی شا. ئەویش کچەکەی بانگ کرد و پێی وت: ئا بڕۆ ئەو ژنە لەگەڵ خۆت بێنە.

دایکی مووسا هات. یەکێ لە ژنە بەردەستەکان مووسای بۆ هێنا. منداڵ خۆی هاویشتە باوشی و وادەمی نایە مەمکەی پێت وابوو بەڵێنێکی بەو ژنە داوە.

چۆن دەبێ شیر نەخوا! ئەو دایکی دلۆڤانیەو ئەمیش سێ رۆژە برسییەتی؟!

---

(١) ئەسوان، یان ئاسوان: یەکێ لە شارەکانی میسرە لە نزیکی دەریای نیل‌دا.

خێزانی فیرعەون و هەموو دانیشتوانی کۆشك تووشی سەرسامی بوون. فیرعەون خۆی کەوتە ناو دوو دڵی و وتی: ئەم منداڵە چۆن وا پێشوازیی لەو ژنە کرد، بڵێی دایکی بێ؟

دایکی مووسا جوابی دایەوە: گەورەم! ئەمن ژنێکی خۆشبۆم و شیریشم گوارایە؛ هەموو منداڵێك پێشوازیم لێ دەکا.

فیرعەون بێ دەنگ بوو و پوولێکی بۆ بڕییەوە.

داکی مووسا منداڵی لە ئامێز گرت و هاتەوە بۆ ماڵی خۆیان.

«ناردمانەوە بۆلای دایکی تا چاوی پێ رۆشن بێتەوەو خەمی نەخوا، بیشزانێ بەڵێنی خوا راستە، بەڵام زۆربەی مەردم ناشارەزان».(١)

## بەرەوکۆشکی فیرعەون

وەختێ مووسا لە شیر بڕایەوە، دایکی هەناردیەوە بۆ کۆشکی فیرعەون. مووسا لە کۆشکا هات بە خۆدا و پێ بە پێی منداڵانی شاگەورە بوو. وێڕای ئەوەش سامی لە پاشا و دەوڵەمەندان شکاو ترسی لە دڵا نەما. بە چاوی خۆی بینی چۆن فیرعەون و دارو دەستەی لە ناو ناز و نێعمەتا گوم بون.

نەژادی ئیسراییل چ تاڵاوێك دەچێژن تا نێعمەتی فیرعەون و کەس و کاری دابین دەکەن.

وڵاخ و چوارپێی فیرعەون چۆن لە تێریا سەریان هاتووە و بەرەی ئیسرائیل لە برسانا دەمرن!

---

(١) قەسەس:١٣.

چۆن لەگەڵ نەتەوەی ئیسراییل وەکوو چوارپێ رەفتار دەکەن! هەزار جۆر نۆکەرییان پێ دەکرێ و بە توندیش جەزرەبە ئەدرێن! مووسا بەیانی و ئێوارە ئەوانەی دەبینی رکی هەڵدەستا و هیچی نەئەوت.

چۆنی رك هەڵنەستێ، وەختێ سووکایەتی بە نەژاد و بنەڵەی بکرێ! ئەو خەڵکە بەرەی پێغەمبەران و تۆرەمەی مەرد و رەندان بوون. بۆچی تاوانی بەرەی ئیسراییل چی بوو؟ ئەوەی لێبەدەر لە نەژادی قیبتی نەبوون و خەڵکی کەنعان بوون؟!

مەگەر کەنعانی بوون تاوانە! نەخێر، ئەمە باوەڕێکی ناپەسەندە!

## مشتی گیان ئەستێن

کاتێ مووساگەنجێکی بەهێزی لێدەرهات، خوا ئاگاداریی و لێزانیی پێ بەخشی. لەو رووەوە زۆری رك لە ستەمکاران هەبوو و چاوی پێیانا هەڵنەدەهات. هەژار و زۆرلێکراوانی خۆش ئەویست و چەشنی تەواوی پێغەمبەران یاریدەریان بوو.

جارێکیان چووە ناو شاری فیرعەون. سەرنجی دا مەردم سەرقاڵی هەڵە و هەرزەیی خۆیانن. دوو پیاوی بەرچاوکەوت خەریکی شەڕ بوون. یەك لەوانە لە نەژادی ئیسراییل و ئەویتریان قیبتی و دژمنی بەرەی ئیسراییل بوو.

ئیسراییلی قیبتییەکەی بە تاوانبار دەرکرد و لە مووسای خواست یارمەتی بدا.

مووسا تووڕە بوو، و مشتێکی دا لە قیبتی، مشتەکە گیانئەستێن بوو. کابرا مرد و مووسا بە دڵ پەشیمان بووەوە. خێرا تێگەیشت ئەو کارەی کارێکی

شەیتان پەسەند بووە.

وەکوو هەموو پێغەمبەرێك، پەشیمانی لای خوا دەربڕی و داوای بەخشینی لێکرد. وتی: «ئەمە شەیتان پێی کردم، دیارە کە دژمنێکی ئاشکراو رێ لێ گومکەرە».(١)

خوا داواکەی مووسای قەبووڵ کرد، چوون مەبەستی کوشتنی کابرا نەبوو، لێیداو، ئەنجامی بوو بەوە.

مووسا پەسنی خوای بەجێ هێناو وتی: بەراستی خوا چاکەی لەگەڵ کردم و لێی بووریم. «من هەرگیز پشتیوانی تاوانباران ناکەم».(٢)

بەیانی بە ترس و چاوگێڕانەوە بەناو شاردا دەگەڕا، کە سەربازانی چاو تیژ و بۆزەنی فیرعەن نەیدۆزنەوە. دەترسا و خۆی دەپاراست؛ نەکوو سەربازان بیگرن و بیدەنە دەستی دیکتاتۆرا

سەربازان لاشەی قیبتییەکەیان بینی بوو. کوژراو یەکێ لە خزمەتکارانی فیرعەون بوو. بەدوای کوژەرەکەیدا دەگەڕان و بۆیان نەئەدۆزرایەوە.

کێ پێی نیشاندایەن، کەس نەیدەناسی، مووسا خۆی و ئیسرائیلییەکە نەبێ؟!

ناوی کوژراوەکە کەوتە سەر زمانان و بوو بە دەنگ و باسی ناو شار؛ بەڵام کەس ئاگای لە کوژرەکەی نەبوو.

فیرعەون قوشقی بوو و بە سەربازانی وت: هەر دەبێ ئەو کوژەرە پەیدا کەن.

---

(١) قەسەس: ١٥.
(٢) قەسەس: ١٧.

## نهێنی ئاشکرا دەبێ

هەر بەیانی ئەو رۆژە مووسا ئیسراییلییەکەی بینییەوە کە لەگەڵ قیبتییەکی تر خەریکی زەرپ و جەنگ بوو.

ئیسراییلی بێ ئەوەی شەرمێك بیگرێ قیڕانی و داوای لە مووسا کرد لەسەری بکاتەوە.

مووسا پێی وت: تۆ پیاوێکی نەسازی! بۆ لە شەڕ و هەرا لەگەڵ ئەم و ئەو دەست هەڵناگری؟ هەر قیڕەت دێ و داوای یارمەتی لە من دەکەی؟! هەر بە تەمای پشتیوانیت لێ بکەم؟ «دیارە رێ گوم کردووی».(١)

مووسا لێیان نزیك بووەوە و دەیویست قیبتییەکە تۆزێ تەمێ بکا.

ئیسراییلی مووسای بینی کە خەریکی لۆمەی بوو؛ ترسا مشتێکی گیانئەستێنی پێ بگەیەنێ و ئەمیش وەکوو قیبتییەکەی [دوێنێ]ی بەسەر بێ. وتی: «مووسا! ئەتەوێ منیش بکوژی، وەکوو دوێنێ یەکێکت کوشت! تۆ هیچ مەبەستێکت نییە ئەوە نەبێ ببیە ملهوڕی ئەم وڵاتە؛ لەوانە نیت کار و باران سامان دەدەن».(٢)

لێرەدا قیبتییەکە مووسای بۆ ناسراو زانی کابرای دوێنێ ئەم کوشتوویەتی.

رۆیشت و هەواڵی بە پیاوانی فیرعەون دا کە کوژەرەکەی دوێنێ مووسا بووە.

---

(١) قەسەس: ١٨. (٢) قەسەس: ١٩.

کاتی هەواڵەکە بە فیرعەون گەیشت تووڕە بوو و وتی: یانی هەر ئەو گەنجەیەکە پەروەردەی کۆشکەو بە نان و نمەکی من گەورە بووە؟

خوا مەیلی لێ بوو مووسا لە شەڕی فیرعەون و سەربازانی رزگارکا. مووسا نیازی کوشتنی ئەو پیاوەی نەبوو، مشتێکی توندی پێ گەیاند، بەڵام بوویە هۆی تێدا چوونی.

بەڵام فیرعەون و پیاوانی بەڵگەیەکی وەهایان هەرگیز قەبووڵ نەدەکرد و ئامادەش نەبوون لە مووسا ببورن. خوا بڕیاری دابوو هێز و دەسەڵاتی فیرعەون بە دەستی مووسا لەناو بچێ و بەرەی ئیسرایلیش هەر بە دەستی ئەو دەرباز بین. بڕیاری دابوو، مووسا مرۆ لە مرۆپەرستی وەرگێڕێ و بیانخاتە سەر رێی خوا پەرەستی.

ئەو ئامانجانەش چۆن ئەهاتنە جێ، ئەگەر دەستی سەربازانی خوانەناسی پێ بگەیشتایە؟

پیاوانی فیرعەون و وەزیرانی، پرس و رای خۆیان کرد و لێبڕان مووسا بکوژن.

لەم نێوانەداکابرایەك وتو ویرەی ئەوانەی بیست و نەخشەی خوێندنەوە. پاشان خۆی بە مووسا گەیاند و لە ویستی دژمن تێی گەیاند. پێی وت: «لەم شارەی وەدەرکەوە؛ ئەمن لە دڵسۆزانی تۆم».(١)

ئەوسا مووسا بە ترس و پارێزەوە لە شارێ وەدەرکەوت و وتی: «پەروەردگاری من! لە شەڕی ئەم گەلە ستەمکارەم رزگار کە».(٢)

(١) قەسەس: ٢٠. (٢) قەسەس: ٢١.

## لە میسرەوە بۆ مەدیەن

لە بارو دۆخێکی وەهادا مووسا چی بکردایە؟! تەواوی میسر مڵکی فیرعەون بوو و سەربازانیشی بە تەواوی چاوتیژیی و بۆزەنییانەوە لە کەمیندا بوون!

لەم بڕگەیەدا خوا فەرمانی پێدا بڕوا بۆ مەڵبەندی عەرەب نشینی مەدیەن، کە دەستی فیرعەونی پێ نەدەگەیشت. مەدیەن بیاوانێك بوو کە پێك هاتبوو لە چەندگوند و شێوازی ژیانیشیان لەگەڵ دانشتوانی میسر فەرقی هەبوو. نە کۆشکی میسریی تیادا بەرچاو دەکەوت و نە بازاڕیش. بەڵام چوون لە دەستی فیرعەون بە دوور بوو، سەرزەمینێکی بەختەوەر بوو.

بەڵێ، بەختەوەر بوو، چوون بۆ خۆی سەر بەست دەژیا و لە ژێر دەسەڵاتی فیرعەوندا نەبوو.

چەن خۆشە ئەو بیاوانەی ئازادیی و دادپەروەریی تیادایە. چەن بەدفەڕە ئەو شارەی بەزەبوونی و کۆیلایەتی دەژی! لە وێدا مەردم هەموو بێ ترس لە شەڕی فیرعەون بەیان لە خەو هەڵدەستان.

لەوێدا خەڵکی بە شەو، بێ ترس لە دڕندەیی پیاوانی فیرعەون دەخەوتن و کوڕانیش سەر نەدەبڕان.

مووسا میسری بەجێ هێشت و بەرەو مەدیەن کەوتە رێ. هەر دەترساو چاوە چاوی بوو؛ ئاخۆ کەسێ بەشوێنیەوە نەبێ؟ بەڵام سەربازان لە ئاستی ئەو، چاویان قووجابوو. پشتی بە خوا بەست و لە میسر هاتە دەرەوە. هەر لە یادی خودا بوو و چاوەڕێی کۆمەکی پەروەرندەی بوو.

«کاتێ رووی لە مەدیەننا، وتی: بەڵکوو پەروەردگارم راستەڕێم پێ نیشان دا».(١)

## لە مەدیەندا

مووسا گەیشتە مەدیەن؛ بەڵام نە کەسی ئەناسی و نە کەس دەیناسی. شەو لە کوێ بخەوێ؟ کێ جێی بکاتەوە؟

لە ناو دوو دڵیدا گیری کرد بوو، بەڵام دڵنیا بوو خوا پەکی ناخا!

تەماشای کرد بیرێك لەو نزیکانە دایە و مەردم خەریکن مەڕو ماڵاتی لێ ئاو دەدەن

دوو کچی بەرچاو کەوت کە لای مەڕەکانی خۆیان گرتبوو بە تەما بوون خەڵکی ئاژەڵی خۆیان تێراو کەن، پاشان ئەوانیش هی خۆیان ئاو بدەن.

وەختێ سەرنجی دان چەشنی باوکێکی دڵسۆز خۆشەویستییان لە ناو دڵیا سەری هەڵدا.

لێی پرسین: ئێوە بۆ ئاویان نادەن؟

وتیان: ئێمە ناتوانین ئاویان دەین، هەتا مەردم دواییان نەیە. چوون ئەوان دەسدارن و ئێمە بێ دەست. ئەوان پیاون و ئێمە لە جنسی ژنن!

هەستیان بەوە کرد، مووسا دەیەوێ بڵێ: ئەی بۆچی یەکێ لە پیاوانی ماڵەوەتان نایە بۆتان ئاو دا؟

دەستی خۆیان خستە پێش و وتیان: «باوکمان پیرێکی بێ هێز و

---

(١) قەسەس: ٢٢.

توانایە».(١)

جوامێری پاڵی بە مووساوە نا، مەڕەکانی بۆ ئاو دان و ڕۆیشتن بە ڕێیانەوە.

جا ئێستا ئیتر بۆ کوێ بڕوا؟! شەو پەنا بە کوێ بەرێ و لە کوێدا بنوێ؟! خۆ نەکەس دەناسێ و نە تاقە کەسێکیش دەیناسی!

«ڕووی نا لە سێبەرێك و وتی: پەروەرێنم! ئەمن هەژارم و ئاتاجی چاکەی تۆم».(٢)

## بانگ کردن

کچەکان زووتر لە جاران گەیشتنەوە ماڵ. باوکیان سەری سوڕما و هۆکەی لێ پرسین.

پرسی: بۆ وا پەلەتان کرد کچەکانم؛ چۆن بوو ئەمڕۆ زوو هاتنەوە؟

وتیان: خوا پیاوێکی هێژای بۆ گەیاندین و مەڕەکانی بۆ ئاو داین.

پیرەپیاو بە لایەوە سەیر بوو زانی ئەو پیاوە غەریبە بووە ئەگینا لە ڕۆژگارێکی وادا کەس ئاوا بەزەیی بەو کچانەدا نایەتەوە. پرسی: ئەو پیاوەتان لە کوێ بەجێ هێشت؟

وتیان: هەر لەوێدا کە بوو، جێمان هێشت؛ پیاوێکی غەریبە بوو، شوێن و جێگەیەکی شك نەدەبرد!

پیرە پیاو وتی: کارێکی چاکتان نەکرد کچەکانم، کابرایەکی غەریب؛ پیاوەتی لەگەڵ ئێمە کردووە و ئاشناو خانەخوێیەکیشی لێرەدا نییە. دەجا شەو

---

(١) قەسەس: ٢٣. (٢) قەسەس: ٢٤.

بڕوا بۆ کوێ و لە کوێدا ڕۆژ بکاتەوە؟!

ئەو هەم مافی میوانی بەسەر ئێمەوە هەیە، هەم هی پیاوەتی!

ئا یەکێکتان بڕوا و لەگەڵ خۆی بێنێتەوە.

«یەك لەو دوو کچە بە شەرمێکەوە بەرەو لای هات و پێی‌وت: بابم بانگت دەکا، تا کرێی ئەو ئاوەت بداتێ وا بۆت هەڵکێشاین».[(١)]

مووسا هەستی کرد خوا نزاکەی لێ قەبووڵ کردووە و جێی بۆ دابین کردووە.

هەستایە سەر پێ. خۆی کەوتە پێشەوە، با چاوی بە کچەکەوە نەبێ. هێژایانە هەنگاوی دەنا.

وەختێ گەیشتنە پێشەوە، پیرە پیاو سەبارەت بە ناوو نشتمان و حاڵ و باری پرسیاری لێکرد. موساش قسەی بۆ کرد و بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە.

پیرە پیاو زۆر بە نەرم و نیانی و لەسەر خۆییەوە گوێی دایە وتەکانی. کاتێ مووساقسەکانی تەواو کرد پێی وت: «ئیتر مەترسە؛ لە دەست گەلی ستەمکاران رزگارت بوو».[(٢)]

## ژن هێنان

مووسا لەماڵی پیرەپیاو [شوعەیب]دا وەکوو میوانێکی بەڕێز و تەنانەت کوڕێکی خۆشەویست مایەوە.

---

(١) قەسەس: ٢٥.        (٢) قەسەس:٢٥.

رۆژێکیان یەکێ لە کچان بە روویەکی خۆش و دڵێکی پاکەوە بە باوکی وت: «بابە بیگرە بە کرێ؛ باشترین کرێکار ئەوەیە هەم بەهێزبێ، هەم بە شەرم».(١)

شوعەیب پرسی: تۆ چۆن دەزانی بەهێزە و بە شەرمیشە کچم؟

وتی: هێزو توانایم لەوێدا بۆ دەرکەوت، کە بەتەنیا سەری بیرەکەی بەرزەوەکرد، ئەوەش کاری چەند کەسە. بۆ بە شەرمی و پاکیشی باوە گیان! بەوەدا زانیم کە لە وەختی هاتنیدا پێشم کەوت و هەر بۆی نەدەڕوانیم. دیارە کرێکار و ڕەنجبەریش دەبێ بە توانا بێ و جێی باوەڕیش بێ. ئەگەر بەهێز و توانا نەبێ ناتوانێ جوان کار بکا. ئەگەر مرۆیەکی جێی باوەڕیش نەبێ توانایيەکەشی بە کەڵکمان نایە.

پێشنیازی کچ لەگەڵ ویستی دەروونی پیرە پیاو سازگار بوو؛ بەڵام ئەو وەکوو باوکێك دەبوا لەو شتانە بیری بکردایەوە.

شوعەیب وەکوو پیرێکی تێ گەیشتوو کەوتە لێکدانەوەی کێشەکە و لەبەر خۆوە وتی: دەجاکێ هەیە لەم گەنجە شیاوتر بێ بۆ زاوایەتی من؟

لە کوێی دنیادا کەسێکی لەم چاترم دەس دەکەوێ؟!

خۆ لە مەدیەندا تاقە کەسێکم بۆ پەیدا نابێ شایانی ئەم کارە بێ!

لەوانەیە خوا ئەم گەنجەی بەو نیازەوە هەناردبێ بۆ لام، ببێ بە زاواو راوێژکارم.

پاشان بە ئارامی و دڵسۆزیی و لێزانییەوە وتی: «من خەیاڵم هەیە یەکێ

---

(١) قەسەس: ٢٦.

لەم دوو کچەم بدەم بە تۆ؛ کە لە پێناویشیا، دەبێ هەشت ساڵان کارم بۆ بکەی».[(١)]

ئەوە لەباتی مارەییەو دەبێ هەشت ساڵەکە تەواو کەی.

«ئەگەر پێشت خۆش بوو بیکەی بە دەساڵ، بە خۆتەو، من نامەوێ تووشی دژوارییت بکەم. ئەگەر خوا مەیلی لەسەر بێ زوو تێدەگەی کە منیش لە ریزی چاکە کاراندام».[(٢)]

پیرە پیاو ترسی هەبوو، مووسا کچەکەی لەگەڵ خۆی بەرێ و ئەو تەنیا بمێنێتەوە. لەو رووەوە حەزی کرد جارێکی‌تر تاقی بکاتەوە، تا ئەگەر جێی باوەڕ بوو لێی جیا ببێتەوە.

مووسا پێشنیارەکەی پێ باش بوو. هەستی کرد کاری خوایە و خوا ئەنجامی بە خێر دەگێڕێ.

خوا خۆی گەیاندیە مەدیەن. بردیە لای ئەو پیرەپیاوە و دڵسۆزیی و خوشەویستی هاویشتە ناو دڵیەوە.

دوایی وتی: [باشە] ئەمە بڕیارێکە لە نێوان من و تۆدا. بەڵام ئاوەز و لێزانی، پاڵی بە مووساوە نا مافی هەڵبژاردن بۆ خۆی بهێڵێتەوە چوون لەوانە بوو ـ لە درێژە دان بەو کارەی ـ ماندوو ببێ.

بەو بۆنەوە وتی: «هەرکام لەو دوو بڕیارەم بردە سەر، نابێ زۆرم لێ بکرێ، خواش لەوەی ئێمە دەیڵێین ئاگادارە».[(٣)]

---

(١) قەسەس: ٢٧. (٢) قەسەس: ٢٧.
(٣) قەسەس: ٢٨.

## گەڕانەوە بۆ میسر

کاتێ بڕیارەکەی مووسا بەسەرچوو، خێزانی لەگەڵ خۆی برد.[1] خوا حافیزی لە شوعەیب کرد و ئەویش دوعای بۆ کردن:

بەرەکەتی خوات هاوڕێ بێ کوڕم! خوا پشت و پەنات بێ کچم!

لەگەڵ ماڵ و خێزانیدا کەوتنە ڕێ تەواوی شەو هەوا سارد و زۆریش تاریك بوو [چارە چ بوو] ئاگر لەو چۆڵ بیاوانەدا لە کوێ بێنن؟

چییان بۆ دەکرا! نە ئاگرێك هەبوو خۆی پێ گەرمەوە کەن، نە ڕۆشنایەکیش، کە ڕێی پێ وەدۆزن؟!

مووسا بەدەم ڕێگە ڕۆیشتنەوە هەر چاوی بۆ ئاگر دەگێڕا.

«لە پڕا ئاگرێکی چاو کرد. بە خێزانی وت: پەلە مەکەن، ئاگرێکم دۆزیەوە؛ بەشکوو یا دەستە ئاگرێکتان بۆ بێنم یا بۆ دیتنەوەی ڕێگا کەڵکی لێ وەرگرم».[2]

بە دڵخۆشییەوە بەرەو لای ئاگر ملی نا.

«وەختێ گەیشتە نزیك ئاگرەکەوە، بانگی لێکرا: ئەی مووسا! ئەمن پەروەرندەی تۆم؛ پێڵاوەکانت کەنە، تۆ لە ناو شیوی پیرۆزی «تووا»دای».[3]

لەوێدا خوا لەگەڵ مووسا کەوتە وتو وێژ و پێی ڕاگەیاند: «من تۆم دەس نیشان کردووە؛ گوێ بگرە بۆ ئەوەی پێت ڕادەسپێردرێ: من خوام و جگە لە

---

(١) قەسەس: ٢٩.
(٢) تاها: ١٠.
(٣) تاها: ١٢، ١١.

من پەرستوویەکی تر نییە. کەوایە هەر من بپەرستە و لە ڕێی نوێژەوە یادی من بکە، ڕۆژی پەسڵان بەرێوەیە». (١)

مووسا گۆچانێکی بە دەستەوە بوو، کە لەگەڵ خۆی دەگێڕا و کەڵکی لێوەردەگرت.

خوای مەزن پرسی: «ئەوە چییە بە دەستەوە مووسا؟» (٢)

مووسا زۆر بە سادەیی و ڕوو خۆشییەوە وەڵامی دایەوە: ئەوە گۆچانەکەمە.

چوون بە عەزرەتی قسە کردن بوو لەگەڵ خوا دا؛ درێژەی بە وتەکانی داو، باسی قازانجی جۆراو جۆری گۆچانەکەی بۆ کرد: «ئەمە گۆچانەکەمە، کە خۆمی بەسەرا ئەدەم. گەڵای پێ دەوەرێنم، بۆ ڕانەکەم و چەند کاری تریشی پێ ئەنجام دەدەم.

خوا فەرمووی: ئا دایخە مووسا!

کە هاویشتی سەرەنجی دا ئەوا مارێکەو بە زویدا دەخزێ. فەرمووی هەڵیگرە مەترسە؛ هەر ئێستا وەکوو خۆی لێ دەکەینەوە». (٣)

پاشان دوەم نیشانەی بە مووسا نیشان دا، کە سپی بوونی دەستی بوو.

فەرمانی پێ دا: «دەستت بکە بە باخەڵتا؛ کە دەرت هێنا ـ بە بێ نەخۆشین ـ سپییە [ئەمەش] نیشانەیەکی ترە». (٤)

---

(١) تاها: ١٤، ١٢.
(٢) تاها: ١٧.
(٣) تاها: ٢١، ١٨.
(٤) تاها: ٢٢.

## ڕێکەوە بۆلای فیرعەون؛ بە تەواوی یاخی بووە

دوای گشت ئەوانە خوا فەرمانی بە مووسا دا، دەست بکا بەو کارەی کە هەر لە بنەوە بۆ ئەوەی دروست کردبوو.

فیرعەون لە سەرزەویدا تەواو لە خۆ دەرچوو بوو، و بەد فەڕیی گەیاندبووە ئەو پەڕی.

هۆزی فیرعەون لە خوا وەرگەڕا بوون و دنیایەکیان گەناند بوو. ئاشکرایە خوا پێی ناخۆشە بەندەکانی لە ڕاستەڕێ لادەن و سەرزەوی ببێتە دیارگەی ستەمکاریی.

خوا دەیویست مووسا بڕوا بۆ لای فیرعەون و گەلەکەی کە: «دارو دەستەیەکی لە ڕێ لادەر بوون».(١)

بەڵام جا مووسا چۆن بڕوا و چۆن لەگەڵ دیکتاتۆردا ڕوو بە ڕوو بێ؟

ئەو کە هەر دوێنێ کابرای قیبتی کوشتبوو و ڕووداوەکە هێشتا تازە بوو!

بە شوێنیا، بە ترسە ترس و شۆنە گومکێ خۆی دەرکرد بوو؛ هەم سەربازان و هەم دانشتوانی کۆشکیش دەیانناسی.

لەو ڕووەوە وتی: «پەروەرێنم! من یەکێ لەوانم کوشتووە، ترسم هەیە بمکوژنەوە!»(٢)

بیری لەوەش کردەوە کە لە قسە کردنیشا زمانی دەگیرێ. بەڵام خوا لە هەموو شت ئاگادار بوو؛ بە سەر گشت ئەوانەدا پێی خۆش بوو مووسا چی

---

(١) قەسەس: ٣٢. (٢) قەسەس: ٣٣.

پێ وترا بوو، بیکا.

پەروەرندەی تۆ فەرمانی بە مووسا دا: ڕێکەوە بۆلای هۆزی ستەمکار، هۆزی فیرعەون؛ ئایا شەرم نایانگرێ؟

مووسا وتی: خوایە دەترسم بە درۆزنم دەرکەن؛ هەناسەشم سوار دەبێ و قسەم بۆ نەیە؛ هارووون بکە بە هاوڕێم. ئەوان من بە تاوانبار دەزانن؛ ترسم هەیە بمکوژن.

فەرمووی: نەء، وانییە. هەر دوو بە نیشانەکانی ئێمەوە بڕۆن خۆمان هاوڕێتانین و هەموو شتێکیش دەبیستین.

بچنە لای فیرعەون و بڵێن: «ئێمە راسپاردەی پەروەردگاری هەموو جیهانین؛ تۆ بەرەی ئیسراییلمان لەگەڵ بنێرە.»[١]

خوا بە مووسا و هارووونی راسپارد، بە ئارامی و نەرمی لەگەڵ فیرعەون رەفتار بکەن.

خوا نەرم و نیانی [تەنانەت] لەگەڵ دژمنانیش تا ئەو رادەیە پێ خۆشە کە فەرمووی: «بە نەرم و نیانی بیدوێنن، بەڵکوو یا بیر بکاتەوە، یان بترسێ.»[٢]

## ڕوو بە ڕووی فیرعەون

مووسا و هارووون چوون بۆ لای فیرعەون. لە کۆڕیدا هەستانەوە، و داوایان لێکرد لا بە لای خوادا بکا.

دیکتاتۆر لە بوێریی مووسا تووڕە بوو. بە زاراوەیەکی لە خۆباییانەوە

(١) شوعەرا: ١٧، ١٠.  (٢) تاها: ٤٤.

وتی: جا تۆ چیت رۆڵە، تا ببیتە کوڕی من و رێنموونیم کەی؟

تۆ هەر ئەو منداڵە نیت ئێمە لە دەریامان گرتیەوە؟! هەر ئەوە نیت خۆمان پەروەردەمان کردی و چەند ساڵێکیش لە ناومانا مایەوە؟

ئەها دوایی ئەو کارەشت کرد، واکردت! دیارە تۆ لە ریزی پێنەزانان دای.(١)

مووسا نە توورە بوو، نە وتەکانی بە درۆ خستەوە. بەرپەرچی نەدایەوە و داوای بە خشینیشی لێنەکرد. بە ئارامی وڵامی دایەوە: «من ئەو کارەم لە دەس قەوما، ئەو کاتە کە تووشی هەڵە بووم و لە ترسی ئێوەش هەڵاتم. دوایی پەروەردگارم لێزانی پێ بەخشیم و بردمیە ریزی پێغەمبەرانەوە».(٢)

تۆ منەتم لەسەر دەنێی کە بە خێوت کردووم؛ بەڵام بیر لەوە ناکەیەوە کە من بۆچی کەوتمە ژێر دەستی تۆ و چۆن پەروەردەت کردم؟

ئەگەر تۆ فەرمانی کوشتنی منداڵانت دەر نەکردایە، دایکم منی نە ئەهاویشتە نیلەوە و نە ئەکەوتمە ژێر چنگی تۆ!

ئایا ئەم چاکەیەت لە بەرامبەر ئەو هەموو دەسدرێژیی و دڵرەقییەی تۆدا هەر شایانی ناو بردن هەیە؟

تۆ رەفتارت لەگەڵ تێکڕای هۆزی من، رەفتار لەگەڵ کەر و گادا بوو. بەزمی سەگت پێ دەگرتن و خراپترین جەزرەبەت ئەدان. ئیتر بەخێو کردنی تاقە منداڵێکیان کەی نیشانەی پیاوەتی تۆیە؟ کە ئەویش هەر لە رووی نەزانی و هەڵەییەوە بوو! «تۆ منەتی ئەو چاکەیەم بە سەرا دەکەی کە گەلی

---

(١) شوعەرا: ١٩، ١٨.

(٢) شوعەرا: ٢١، ٢٠.

ئیسرائیلت کردووەتە بەندەی خۆت».[(١)]

## بانگیشتی خواپەرستی

فیرعەون بەزی و قسەیەکی بۆ نەمایەوە. پاشان بە نیازی خۆ رزگار کردن، پرسی: «ئەرێ راهێنەری جیهان چییە؛ ئەوەی تۆ ناوی دێنی؟

مووسا وتی: پەروەرندەی ئاسمانەکان و زەمینە و ئەوەی لە نێوانیاندایە؛ ئەگەر ئێوە ئاوەزی خۆتان بخەنە کار!»[(٢)]

فیرعەون لەم جوابە توند بوو. «بۆ ئەوە بەشدار بوانی کۆڕ لە مووسا هەڵگێڕێنێ، پێی وت: خۆ جوان گوێتان لێوەیە!»[(٣)]

مووسا قسەکانی خۆی نەبڕی؛ بەڵکوو دووەمین زەبری بە فیرعەون گەیاند و وتی: «راهێنەری ئێوە و پێشینیانی ئێوەش هەر ئەوە».[(٤)]

فیرعەون کە تووڕەیی زۆری بۆ هێنا بوو، خۆی بۆ نەگیراو وتی: «ئەم پێغەمبەرە کە بۆلای ئێمە هەنێردراوە، دیارە شێتێکی تەواوە».[(٥)]

مووسا دیسان لەسەر وتەکانی رۆیشت. سێهەمین دەستی لە فیرعەون گۆزایەوە و وتی: «پەروەرندەی خۆرهەڵات و خۆرنشین و نێوان ئەوانیشە، ئەگەر تێ فکرێن!».[(٦)]

فیرعەون بۆ ئەوەی فکری مووسا لەو قسە دڵ تەزێنانە دوور خاتەوە و رکی گەورەپیاوانی دەورو بەری هەستێنێ وتی: «باشە ئەی ئەوانەی پێشوو

---

(١) شوعەرا: ٢٢.
(٢) شوعەرا: ٢٤، ٢٣.
(٣) شوعەرا: ٢٥.
(٤) شوعەرا: ٢٦.
(٥) شوعەرا: ٢٧.
(٦) شوعەرا: ٢٨.

چۆن بوون؟!»(١)

ئەم پرسیارەی بەو مەبەستە هێنایە گۆڕێ، ئەگەر مووسا وتی: لەسەر ڕاستەڕێ بوون، بڵێ: جا خۆ ئەوانیش بت پەرست بوون. ئەگەر وتیشی: نەزان و ڕێ گوم کردوو بوون، دانیشتوانی کۆڕ تووڕە ببن و بڵێن: مووسا جنێو بە پێشینیانمان دەدا! بەڵام مووسا لە فیرعەون لێزانتر بوو، چوون تیشکی خوای لە دڵا بوو.

بۆیە وتی: «زانینی ئەوانە لە دەفتەرێك دایە و لەلای پەروەرێنمە، کە نە هیچی لێ گوم ئەبێ و نە لە بیریشی دەچێ».(٢)

ئەمجا مووسا ڕاستییەکی هێنایە ئاراوە کە فیرعەونی تیا گیرۆدە ببێ و نەتوانێ خۆی لێ دەرکا. وتی: «پەروەردگارم نە تووشی هەڵە دەبێ و نە هیچیشی لە بیر دەچێ. ئەوەی زەوی بۆ کردن بە رایەخ و ڕێبازگەلی بۆ دروست کردن و ئاوی لە حەواوە باراند».(٣)

فیرعەون بە حتەوە بوو قڕوقەپی کرد و نەیتوانی هیچ بڵێ. بەس هەر ئەوەی بۆ وترا، کە ملهوڕان کاتی بۆڕ خواردن و قوشقی بوون دەیڵێن.

وتی: «بێتوو جگە لە من بەندایەتی پەرستوویەکی‌تر بکەی بزانە جێت بەندیخانەیە».(٤)

## موعجیزەکانی مووسا

کاتێ فیرعەون ئەو تیرەی لە مووسا هاویشت [هەڕەشەی لێکرد]،

---

(١) تاها: ٥١.
(٢) تاها: ٥٢.
(٣) تاها: ٥٣، ٥٢.
(٤) شوعەرا: ٢٩.

مووسا لێبڕا بە تیری خوا لێی بداتەوە.

لێی پرسی: «ئەگەر نیشانێکی ئاشکرام بۆ هێنای چی [هەر دەمخەیە بەندیخانەوە]؟!

وتی: ئادەی بیهێنە ئەگەر درۆ ناکەی!

مووسا گۆچانەکەی فڕێ دا؛ بوو بە ئەژدیهایەکی بە ڕاستی. دەستیشی دەرهێنا هەموو تەماشاکەران بینیان و سپی بوو.»[(١)]

لێرەدا فیرعەون قسەیەکی بۆ وتن: دەستکەوت. بە کەسایەتییەکانی دەوری وت: «[سەرنج بدەن] جادووکارێکی چەند شارەزایە!»[(٢)]

دانشتوان بۆیان سەندەوە: بەڵێ، گومانی تیا نییە کە جادووگەرێکی تەواوە.

مووسا جوابی دانەوە: «ئێستا کە ئەم ڕاستییەتان بۆ دەرکەوتووە ناوی دەنێن جادوو! بە ڕاستی جادووە ئەمە؟ جادووکاران هەرگیز ڕزگار نابن!»[(٣)]

فیرعەون تیرێکی تری ئاراستەی مووسا کرد و وتیان: «بۆ ئەوە هاتوویەوە ناومان، لەو ڕێگە باو باپیرانمان لە سەری بوون لامان دەی و خۆتان کەن بە گەورەی ئەم وڵاتە؛ ئێمە باوەڕتان پێناکەین».[(٤)]

فیرعەون تێکۆشا ـ بە شێوازی ملهوڕان ـ دەور و بەر لە مووسا بترسێنێ.

پێ وتن: «ئەیەوێ بەو جادووەی هەموتان لە نشتمانی خۆتان وەدەرنێ؛ ئێوە دەڵێن چی؟»[(٥)]

---

(١) شوعەرا: ٣٢، ٣٠.
(٢) شوعەرا: ٣٤.
(٣) یۆنس: ٧٧، ٧٦.
(٤) یۆنس: ٧٨.
(٥) شوعەرا: ٣٥.

[ئەوانیش] داوایان لە فیرعەون کرد، بۆ کۆڵدان بە مووسا جادووکارانی وڵات کۆ بکاتەوە.

داخوازییەکە هاتە جێ. بە وڵاتی میسردا جاڕ درا: خەڵکینە! کێ شتێك لە جادوو دەزانێ خۆی بگەیەنێتە بارەگای شا.

جادووکاران لە هەموو ناوچەکانی وڵاتەوە [هاتن و] یەکان گیر بوون.

ڕۆژی دیاری کراو، ڕۆژی جێژنی دانیشتوانی میسر بوو.

بە مەردمیان وت: «ئایا ئێوەش کۆ دەبنەوە؟ ئەگەر ئەم جادووکارانە سەرکەوتن، ئێمەش دەبینە شوێنکەوتوویان!»(١)

## بەرەو مەیدان

لە چاشتینگادا هەر مەردم بوو، لە ماڵ دەرەدەهاتن و دەستە دەستە بەرەو شوێنی دیاری کراو دەچوون.

پیر و گەنج و ژن و پیاو و منداڵ بەرەو مەیدان ڕۆیشتن.

بە جۆرێکی وا کەس لە ماڵێ‌دا نەما، نەخۆش و لاکەوتەی لێ‌بەدەر لە «ئەلمەتەریە»دا، باس هەر باسی جادووکاران و ناو هەر ناوی ئەوان بوو.

- ئاخۆ جادووگەرەکەی ئاسوانیش هاتبێ ئەو یەکە مەزنەکەیان؟.

- بەڵێ، جادووکاری ئەل‌ئوقسور و دانە بە ناوبانگەکەی ئەلجیزەش!(٢)

- ئەنجامی کارت پێ چۆنە کاکە، کێ دەیباتەوە؟

(١) شوعەرا: ٤٠، ٣٩.

(٢) ئەسوان و ئوقسور و ئەلجیزە: ناوی سێ شاری میسری ئەوسەردەمەن.

ـ میسر لە راستیدا جگەرگۆشەکانی خۆی ناردۆتە مەیدانەوە!

ـ بڵێی کابرایەك تاق و تەنیا بە سەر هەموویانا سەرکەوێ!

ـ کوڕە! مووسا و برای چۆن ئەتوانن کۆڵ بەوانە بدەن. ئاخر ئەوان لە کوێ جادوو فێر بون؟

ـ ئەوەیان کە لە کۆشکی شادا گەورە بوو. دوایی بە پارێز و دڵە لەرزێ لە میسر دەرچوو و چەند ساڵێکیش لە مەدیەن مایەوە. ئیتر جادوو لە کوێ فێربون؟

ـ لە میسر؟ کە نە! لە مەدیەن؟ خۆ هەر نە. ئێمە هەرگیز نەمان بیستووە فێرکاری جادوو لە وێدا هەبووبێ!

هۆزی ئیسراییل بە ترس و ئومێدەوە هاتن؛ شایەت ترسیشیان لە ئومێدیان زیاتر بوو.

[لە بەر خۆوە ئەیانوت]: خوا بەزەیی بە کوڕی عیمرانا بێتەوە! خوا یارمەتی بەرەی ئیسراییل بدا!

جادووگەران بە پەت و فیز و دەماریانەوە سەریان هەڵدا. بە جل و بەرگی رەنگاو رەنگ و داردەستەکانیانەوە دەرکەوتن. بە حیلکە حیلك و کەش و فشەوە هاتنە ناو مەیدان.

ئەمڕۆ رۆژی هونەرنواندنە! رۆژێکە شا چاودێری هونەرمەندیی ئێمەیە! ئەو رۆژەیە کە گەل سەرکەتنمان بە چاوی خۆی دەبینێ.

کە گەیشتنە پێشەوە لە فیرعەونیان پرسی: «ئەگەر ئێمە بردمانەوە پاداشێکمان پێ دەدەرێ؟

وتی: بەڵێ، ئەگەر وابوو، دیارە لە نزیکانی خۆم دەبن».(١)

بەڵێ، گرنگترین خەڵاتی پاشایان دەبێ بەوە! پاداشی فەرمانڕەوایان لەوە بەولاتر نییە!

ئا ئەوەیە پیاوانی پێ دەخڵەتن! هەر ئەوەیە کە لە کەمینی پاڵەواناندایە!

جادووگەرانیش بەو بەڵێنەی فیرعەون گەلێك خۆشحاڵ بوون.

## لە نێوا راست و درۆدا

مووسا پێی وتن: «چیتان بۆ هاویشتن ئامادە کردووە بیهاون».(٢)

«ئەوانیش پەت و دار دەستەکانیان فڕێ داو وتیان: سوێند بە گەورەیی فیرعەون خۆمان سەردەکەوین».(٣)

مەردم مارگەلێکیان بەرچاو کەوت، کە بە ناو مەیدانەکەدا لە خزان و رۆیشتنا بوون. وێرای سەر سوڕمان ترساشن. پاشەکشێیان کرد و دەسیان بە هەرا کرد: مارەکان، مارەکان!

ژنان قیژە قیژیان پێکەوت و منداڵان گریان. قیڕەی مارەکان، مارەکان، لە مەیدانا بەرزوە بوو.

ئەوەی مەردم دیان مووساش دیتی. «پەت و دار دەستەکانی بینین کە بە هۆی جادوو چەشنی مار بە سکە خشێ دەرۆیشتن».(٤) تووشی سەرسامی بوو؛ لە ئەنجاما ترسیشی نشتە دڵ.

چۆن نەترسایە؟ رۆژ رۆژی کێبەرکێ بوو. پیاو لە کاتی کێبەرکێدا یا

(١) شوعەرا: ٤٢، ٤١.
(٢) یۆنس: ٨٠.
(٣) شوعەرا: ٤٤.
(٤) تاها: ٦٦.

دەگا بە رێز و حورمەت، یاکوو لۆمە و سووکایەتی.

ئەگەر جادووکاران ـ خوا نەکردە ـ بیبەنەوە!

ئەگەر ـ خوا نەخواستە ـ مووسا دایبنێ!

ئەنجامی کار چۆن دەبێ؟ پەنا بەخوا!!!

دیارە سەرکەوتنی مووساش، سەرکەوتنی تاکە کەسێك نییە، بەڵکوو سەرکەوتنی ئایینە بە سەر فیرعەوندا! زاڵبوونی راستییە بە سەر ناراستیدا.

خوا نەیکا! خوا بە سەریا نەهێنێ!

بەڵام خوا زاتی نایە بەر مووسا و پێی وت: «ترست نەبێ دڵنیابە تۆ دەیبەیەوە.

ئەوەی لە دەستی راستت دایە بیهاوە، هەرچی ئەوان کردوویانە قووتی ئەدا؛ ئەوەی ئەوان کردوویانە فێڵی جادووگەرانە؛ جادووگەران لە هەر کوێ بن سەرکەوتنیان بۆ نییە».(١)

مووسا وتی: «هەرچی ئێوە کردتان جادوو بوو، هەر ئێستاکەش خوا هەڵی دەپێچێ. خوا کردەوەی خرابکاران راست ناهێنێ، بە نیشانەکانی خۆی راست بوونی راستییەکان پیشاندەدا. هەرچەند تاوانبارانیش پێیان خۆش نەبێ.»(٢)

«مووسا گۆچانەکەی خست. لە ناکاو بوویە ئەژدیهایەك و چیيان بەرهەم هێنابوو هەمووی قووت دا».(٣) «راستی کەوتە روو ئەنجامی کاری ئەوان بە هیچ دەرچوو».(٤)

---

(١) تاها: ٦٩، ٦٨.

(٢) یونس: ٨٢، ٨١.

(٣) شوعەرا: ٤٥.

(٤) ئەعراف: ١١٨.

جادووکاران هەشەکەیاندا و بەحتەوە بوون!

ئا ئەمە چ رازێکە؟! ئێمە خۆمان جادووکارین، بە سەرو بنی جادوو شارەزاییمان هەیە و شێوازی جۆراو جۆریشی دەزانین! مامۆستایانی ئەم هونەرە و بەڵکوو پێشەوایانی ئەم هونەرەشین! ئەمە جادوو نییە! شتێکی جیا لە جادووە!

ئەگەر جادووبایە ئێمە بە جادوو لێمان ئەداو هونەرمان بە هونەر تێك دەشکاند!

بەڵام هونەری جادووی ئێمە لە بەرامبەر ئەمەوە خۆی پێ نەگیرا. وەکوو شەونمی خۆر لێ کەوتوو لەناو هەڵگیراو گوم بوو.

ئەم راستییە لە کێوەیە؟ بێ گومان هەر لە خواوەیە! [لەم بڕگەیەدا] جادووکاران گەیشتن بەو بڕوایە کە مووسا راسپاردەی خوایە و خوا موعجیزەی پێ بەخشیوە!

ئەمجا تێکڕا قیڕاندیان و بە دەنگی بەرز رایانگەیاند: ئەوا ئێمە بڕوامان هێنا بە پەروەرندەی مووسا و هاڕوون. پاشان کەوتن بە سوژدە داو وتیان: «ئەوا خۆمان سپارد بە پەروەرێنی هەموو جیهان و راهێنەی مووسا و هاڕوون!»(١)

## هەڕەشەی فیرعەون

لێرەدا شێتی فیرعەون سەری هەڵدایەوە هەڵ ئەستایە سەر پێ و

(١) شوعەرا: ١٢٢، ١٢٠.

دائەنیشتەوە، ئەی‌نەڕاند و دانی دەتەقاند. فیرعەونی لێ قەوماو بە تەمای شتێکی‌تر بوو. هەرگیز بە خەیاڵیدا نەدەهات ئاوای بەسەر بێ!

ئەو لێبڕا بوو بە جادووگەران مووسا تێکشکێنێ؛ کەچی جادووگەران بوون بە پێشمەرگەی مووسا. چاوەڕوان بوو جادووکاران وابکەن بە مووسا کەس باوەڕی پێ نەمێنێ؛ بەڵام خۆیان بوونە یەکەمین دەستەی باوەڕ پێ هێنەری.

[مەیلی خوا وابوو] تیرەکانی هەموو دایانەوە لە خۆی. وای بیر دەکردوە وەکوو فەرمانڕەوای لەش و تەنی مەردمە فەرمانڕەوای بیر و ئاوەزیشیانە.

هەروا کە فەرمانڕەوای زمانانە، فەرمانڕەوای دڵانیشە.

لای وابوو تاقە کەسێك لە وڵاتی میسردا پەیدا نابێ، کە بێ ئیزنی ئەو فکر بکاتەوە یاکوو باوەڕ بە شتێك بهێنێ.

بە ملهوڕیی و بادیهەواییەوە دایخوڕی بە سەریانا:

«بەر لەوە من ئیزنتان بدەم بڕواتان پێ هێنا؟!»(١)

یە شوێنیا زۆردارانە تاوانباری کردن و وتی: «دیارە هەر ئەو [مووسا] گەورەتانە و خۆشی فێری جادووی کردوون!»(٢)

پاشان دایخوڕییەوە: «ئەم فێڵ و تەڵەکەتان بۆیە لە شاردا خستە کار دانیشتوانی وەدەرنێن، لە دواییدا تێدەگەن!»(٣)

بۆ جاری سێهەم تیرێکی ژەهراویی کە دوایین تیری تیردانی ملهوڕانە، بۆ هاویشتن. پێی وتن: «دەست و لاقتان بە پێچەوانەوە دەبڕم و هەمووتان لە

---

(١) شوعەرا: ٤٩. (٢) شوعەرا: ٤٩.

(٣) ئەعراف: ١٢٣.

سێداره دەدەم».[(١)]

خاوەن باوەڕان بە قەڵغانی باوەڕو خۆڕاگریی هەموو ئەو تیرانەیان لە خۆ گواراکرد. جوابیان دایەوە: «ئێمە هیچ ترسێکمان نییە؛ ئەوسا دەچینەوە لای پەروەرندەمان! ئێمە بە هیوایـن پـەروەردگارمان لە گـوناهەکـانمان بـبورێ؛ چوون بەر لە هەموو کەسێك بڕوامان هێناوە».[(٢)]

«باوەڕمان بە خوا هێنا بەڵکوو لە هەڵەکانمان و ئـەوەی تـۆ بـە بـۆنـەی جادووەوە توشت کردین ببوورێ. خوا سەرچاوەی خێرو چاکەیە و تاهەتایە هەر دەشمێنێ.

بێ گومان هەرکە بە تاوانباریی بڕواتەوە لای پەروەردگار، جێی دۆزەخە و ـنەمر و نەژی ـ تیادا دەمێنێتەوە. ئەوانەش کە خاوەن باوەڕ و ئاکار چاکن و دەچنەوە لای، دارای پلە و پایەی بەرزن. جێگایان باخاتێکە جـۆگـەیان بـە بەردەمدا دەڕوا و بۆ هەمیشە تیا دەبن؛ پاداشی پاکان وایە».[(٣)]

## نەزانی فیرعەون

کێشەی مووسا، فیرعەونی واخستە ناو پەژارەوە خەوی لێ هـەڵگیرا و خواردنی لێ بێزرا.

کەسانیتریش تووڕەیان دەکرد و ئەیانوت: «تۆ چۆن ڕێ بـە مـووسا و هۆزەکەی دەدەی وڵات بشێوێنن و خۆت و پەرستووەکانیتر وەلانێن؟!»[(٤)]

دوایی فیرعەون رایگەیاند: «هـەر بـەم زوانـە کـوڕەکـانیان دەکـوژین و

(١) شوعەرا: ٤٩.
(٢) شوعەرا: ٥١، ٥٠.
(٣) تاها: ٧٦، ٧٣.
(٤) ئەعراف: ١٢٧.

ژنەکانان [بو خزمەتکاریی] ئەهێڵینەوە. ئێمە بە دەسڵاتین و بە سەریاندا زاڵین».(١)

فیرعەون لە تەقالادا بوو بەڵکوو بە هەر فێڵێك بووە بەرەی ئیسرایل و خەڵکی میسر لە مووسا دوور بخاتەوە.

بەو نیازەوە بە ناو هاونەژادانی خۆدا کەوتە گاڵ و بخوڕ و لێی دەپرسین: «گەلی من! ئایا خاکی میسر و ئەو چۆمانەی بە بەبەریدا دەچن گشتی هی من نییە، خۆتان شایەت نین؟! ئایا من چاترم یا ئەوکابرا بێ پایە و مایە، کە نازانێ رەوانیش قسە بکا؟!»(٢)

ئەوسا بە ئارامی و لە سەرخۆییەوە رووی لە پیاو ماقووڵان کرد و پێی وتن: «گەورە پیاوان! وا نازانم ئێوە جگە لە من پەرستوویەکی ترتان هەبێ!!»(٣)

پاشان وەك ئەوەی دوای بیرکردنەوە و بۆ داچوونێکی زۆر بیەوێ ئامۆژگاریی گەلەکەی بکا، ساویلکانە وتی: «ئا، هامان! تۆ خشتی کاڵم لەو کوورەدا بۆ سوور کەوەو برجێکم بۆ دروستکە، بەڵکوو لە وێوە خواکەی مووسا بدۆزمەوە! لام وایە لە ریزی درۆزناندا بێ».(٤)

هامان [وەزیر] خشتی سوور کردەوە و برجی بۆ ئامادە کرد؛ بەڵام چەندە بەرزو هەتا کوێ؟!

هامانی وەزیر و بەناو، ئەندازیاران لە کار کەوتن و قوڕ و ئاجۆر دوایی هات؛ بەڵام فیرعەون هێشتا زۆر لە خوارەوە بوو. بە هەورانیش نەگەیشت، تا

(١) ئەعراف: ١٢٧. (٢) زوخروف: ٥٢، ٥١.

(٣) قەسەس: ٣٨. (٤) قەسەس: ٣٨.

بگا بە مانگەشەو و پاشان هەتاو!

بە هەتاو نەگەیی، تا دەگا بە ئەستێران و دوایی ئاسمانیش!

لە ئەنجامدا بەزی و بە شەرمەزاریی و دەستەپاچەییەوە لە جێی خۆیدا دانیشتەوە. فیرعەونی نەزان ئاگای لەوە نەبوو کە «خوا، زەوی و ئاسمانە بڵندەکانی وەدی هێناوە».(١) «چی لە ئاسمانەکان و زەمین و ئەوەی لە نێوان ئەوان و لە ژێر خاك دایە هەموو هی ئەون».(٢)

«لە ئاسمان و لە زەوی تاقە پەرستوو خۆیەتی».(٣)

سەرەنجام هیچ ڕێیەکی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ مووسا لە ناو بەرێ. ئینجا کاری خۆشی بەوە پاسا بدا، کە مووسا خەریکە وڵات تووشی شێوان شێو دەکا.

[بەو بۆنەوە] وتی: «لێم گەڕێن موسا بکوژم، با پەنا بەرێتە بەر پەرودەرندەی. ترسم لێهاتووە دینەکەتان بگۆڕێ و شێوان شێو بخاتە سەر زەوییەوە!»(۴)

## خاوەن باوەڕی بنەماڵەی فیرعەون

کاتێ فیرعەون لێبڕا مووسا بکوژێ، یەکێ لە خزمانی خۆی کە هێشتا باوەڕی خۆی ئاشکرا نەکرد بوو، هەستایەوەو وتی: «جا ئێوە، کابرایەك بە تاوانی ئەوە بۆ دەکوژن کە دەڵێ: خوا پەروەرندەمە و لە لایەن پەروەرێنتانەوە

(١) تاها: ۴. (٢) تاها: ۶.

(٣) زوخروف: ٨۴. (۴) غافیر: ٢۶.

چەند نیشانەیەکی ئاشکرام بۆ هێناون؟»[(١)]

ئەو پیاوە لێهاتووە لێی پرسین: «ئێوە بۆ وا بوونەتە دژمنی مووسا؛ جەزرەبەی بۆ دەدەن؟

وەختێ بڕوای پێ ناهێنن لانیکەم لێی گەڕێن؛ چاکە، خراپە، خۆی و ڕێگای خۆی».[(٢)]

«ئەگەر دەڵێن درۆ دەکا؛ زیانی درۆی رووباری خۆی دەبێتەوە». «ئەگەر ئێوە سزای بدەن و ئەو بە پێغەمبەر دەرچێ، دوایی بەشتان جەهەندمە.

ئەگەر راستیشی کرد، دیارە بەشێك لەو شتانەی بەڵێنی پێ دابوون پێتان دەگا.»[(٣)]

برایانی من! ماڵ و دارایی بای هەواتان نەکا! بە سپاو ساتتان مەنازن!

«خزمینە! ئەمڕۆ ئێوە بە دەسەڵاتن و بەسەر ئەم عەرزەدا زاڵن؛ بەڵام ئەگەر خوا تووشی تەنگانەی کردین، ئەوساکێ یارمەتییمان دەدا؟!»[(٤)]

فیرعەون لە جوابدا وتی: «من هەر ئەو ڕێگەتان بۆ دادەنێم کە خۆم بە چاکی دەزانم و ئەویش ڕێی سەربڵندییتانە».[(٥)]

ئەو پیاوە جوامێرە تێکۆشا هۆزەکەی لە مەترسی پاشە رۆژ و سەرەنجامی ستەمکاریی ئاگادار کا. بەو بۆنەوە وتی:

«گەلی من! ترسم هەیە، ئەوەی بەسەر نەتەوەکانی‌تر هاتووە، بەسەر ئێوەش بێ. وەك ئەو بەڵایە تووشی گەلی نوح و عاد و سەموود بوو ئەوانەی

---

(١) غافیر: ٢٨. (٢) غافیر: ٢٩.
(٣) غافیر: ٢٨. (٤) غافیر: ٢٩.
(٥) غافیر: ٢٩.

پاش ئەوان هاتن. خواش زوڵم لە بەندەکانی ناکا.(١)

پاشان ترسی ڕۆژی پەسڵانیشی خستەوە بیریان: ڕۆژی پەسڵان چۆن ڕۆژێکـــە؟ «ڕۆژێکـــە، بـــرا لە بـــرای، لە داك و بـــابی، لە هـــاوژین و لە جگەرگۆشەکانی ڕادەکا. بە جۆرێکی وا هەرکە ئەوەندە سەرقاڵی کار و باری خۆیەتی، کەس نایپەردەژێتە سەر کەس».(٢)

«هەر لەو ڕۆژەدا دۆستان دەبنە دژمنی یەکتر، خۆپارێزانی لێ بەدەر».(٣)

«خزمایەتی لە نێواندا نامێنێ و کەس لە کەس ناپرسێ».(٤)

لەو ڕۆژەدا تاقە دەسەڵاتدار [خوا] بانگ دەکا: «ئەمڕۆ فەرمانڕەوایی بۆ کێیە؟ هەر بۆ خوای تاك و تەنیای بە سەر هەموو شتدا زاڵە».(٥)

ڕۆژێکی واکە مەردم ئەناڵێنن و هاواریانە؛ هەندێ بانگ لە هەندێکی تر دەکەن. ڕوو لە یەکتر وەردەگێڕن و هەڵدێن. هیچ ڕێگەیەك بۆ ڕزگـاریی لە سزای خوا شك نابەن.

دیسان ڕووی تێکردنەوە و پێی وتن: «هۆزی من! ئەمن ترسی ڕۆژێکم لە دڵایەکە لەو پەڕی لێقەوماندا هاوارتان بەرز ببێتەوە؛ ئەو ڕۆژەکە بەرەو پاش دەگەڕێنەوە و چارەیەك بۆ دەرچوون لە ئارادا نییە؛ ئـەوەش خـوا ڕێی لێ بگۆڕێ کەس نایخاتەوە سەر ڕێ».(٦)

درێژەی بە قسەکانی داو وتی: بە ڕاستی خوا نـیعمەتێکـی گـرنگی پـێ بەخشی بوون، بەڵام ئێوە پێتان نەزانی و بایەخی شیاوتان پێ نەدا؛ وەختێ لە

---

(١) غافیر: ٣٠، ٣١.
(٢) عەبەس: ٣٧، ٣٤.
(٣) زوخروف: ٦٧.
(٤) موئمینوون: ١٠١.
(٥) غافیر: ١٦.
(٦) غافیر: ٣٣، ٣٢.

دەستان دەرچوو، جا پەشیمانی بوونەوە. ئەو نێعمەتەش یۆسفی پێغەمبەر بوو کە بە باشی نەتانناسی و بە تەواویی لە بەرچاوتان نەیدەنواند.

کاتێ کۆچی دوایی کرد ئەوساکەوتنە بیر کردنەوەی: پاکی بۆ خوایە! لە توانای کام پێغەمبەر، کام فەرمانڕەوا؛ کام ئادەمیزادایە، شان لە شانی یۆسف بدا!

ئاخۆ دوای ئەو پێغەمبەری ئێمە کێ دەبێ؟! بڵێی وێنەیمان دەسکەوێتەوە؟!

هەرگیز! وێنەی هەرنابێتەوە!

«زووتر یۆسفیش بە چەند بەڵگەوە هاتە ناوتان، بەڵام ئێوە لە بەڵگەکانی دوو دڵ بوون و باوەڕتان پێ نەهێنا. کاتێ کە مرد، وتتان: ئیتر خوا دوای ئەو پێغەمبەر نانێرێ». (١)

دوای ئەم پێغەمبەرەش دیسان ئەمە کارتانەو بەشتان هەر دەبێتە پەشیمانی.

## راوێژ

خزمەکەی فیرعەون راوێژی بۆ هۆزەکەی کرد و دڵسۆزانە راست وهەڵەی بۆ لێکدانەوە: «ئەو پیاوە خاوەن باوەڕە وتی: خزمینە! ئەگەر بەگوێم کەن، من شارەزای راستەڕێتان دەکەم». (٢)

ئەو پیاوە تێگەیشتووە ئاگای لەوە هەبوو کە گەلەکەی مەستی ژیانی

---

(١) غافیر: ٣٤. (٢) غافیر: ٣٨.

مادیین و ئەوەش کە فیرعەونی ئاوا تووشی بادی هەوایی کردووە، دارایی و دەسەڵاتەکەیەتی. دەشیزانی ژیانی دنیا خەونێکە وەکوو هەموو خەونەکان و سێبەرێکی روو بە نەمانە.

ئەوەی وا ناهێڵی هۆزەکەی شوێنی مووسا بکەون، هەر ئەو مەستی لەزەتی مادیی و دنیاییەیە.

چوون مەست نەدەبینێ و نە تێشدەگا.

کەوایە شتێکی سەیر نییە ئەگەر ئەوانە دەنگی مووسا نەبیستن.

ئەوکەوتبوە سەری لە خەوی مەستییان داچڵەکێنێ. پێی وتن: «گەلی من! ژینی ئەم دنیا کاتییە و دەبڕێتەوە، بەڵام هی ئەو لا هەمیشەییە».(١)

لە وڵامدا هەندێ لە گێل و تێنەگەیشتوانی هۆزەکەی لێیان داوا کرد بێتەوە سەر رێی ستەم و هاوکار بۆ خوا دانان [ئایینی باب و کاڵیان].

وەختێ بەرەو خوا بانگێشتی دەکردن، لێیان دەخواست بگەڕێتەوە سەر دینی باو و باپیران!

کاتێ دیتی هەر لە سە ر داخوازی خۆیان سوور و پێداگرن، پێی وتن: «خزمینە! چیمە، من بەرەو رزگاریتان رێنموونی دەکەم،

ئێوە بەرەو ئاگرم پەل دەکێشن؟

لێم دەخوازن بەرهەڵستی خوا بوەستم و شتێك بکەم بە هاوکاری کە زانستێکم بە سەریا نییە. بەڵام من ئێوە بۆ لای دەسەڵاتداری لێبوردوو بانگ دەکەم».(٢)

---

(١) غافیر: ٣٩.	(٢) غافیر: ٤٢، ٤١.

لێی پرسین: کام پێغەمبەر لە لایەن پەرستووەکانی ئێوەوە هاتووە؟ چ کتێبێك [لەوێوە] بەڕێ کراوە؟ یا کێ بانگێشت کراوە؟ «ئەوانە تەنیا چەند ناوێکن کە ئێوە و باب و کاڵتان ئەوانەتان پێ ناوناون. خواش بەڵگەیەکی باوەڕ پێدەری لە مەڕ ئەوانەوە نەهەناردووە».(١)

بەڵام ئەوەتا چەندین راسپادە مەردمیان بۆ بەندایەتی خوا بانگ کردووە. ئەوا ئیبراهیم؛ ئەوا یۆسف؛ ئەمەش مووسای پێغەمبەر.

لە هەر شتێکدا نیشانەی خوا بەدی دەکرێ و لە هەر جێگایەکا بانگەشەی خوا پەرستی لە ناودا هەیە.

«دیارە ئێوە داوا لە من دەکەن شتێك بپەرستم کە نە لەم دنیایەدا شتێکی لە دەس دێ و نە لەو دنیاشدا».(٢)

سەرەنجام وەختێ لە دەست لاساریی و بێ ئاوەزیی ئەوکۆمەڵە هیوا بڕاو بوو، جێی هێشتن و پێی راگەیاندن: «لە داهاتوودا وتەکانی منتان دێتەوە بیر، من کار و باری خۆم بە خوا ئەسپێرم؛ خوا چاودێری بەندەکانی خۆیەتی».(٣)

مەردم قوشقی بوون و دارو دەستەی فیرعەون کەوتنە فکری کوشتنی. بەڵام خوا ئەوی پاراست و دژمنانی لەناو برد. «خوا ئەوی لە ئاکامی پیلانی ئەوان رزگار کرد و ئەوانەش کە سەر بە فیرعەون بوون بەڵا گەمارۆی دان».(٤)

---

(١) نەجم: ٢٣. (٢) غافیر: ٤٣.
(٣) غافیر: ٤٤. (٤) غافیر: ٤٥.

## ژنی فیرعەون

[وترا کە] فیرعەون پێی وابوو وەکوو تەن و لاشەی مەردم لە ژێر دەسەڵاتی ئەو دایە، بیرو ئاوەزی مەردمیش لە ژێر دەسەڵاتی دایە.

چۆن دەستی بە سەر دەم و زمانی خەڵکیدا دەڕوا. هەرواش دەستی بە سەر دڵ و دەرونیانا دەڕوا.

لای وابوو تاقە مرۆیەك لە میسردا نییە دڵی بڕواتە سەر شتێك، یا باوەڕ بە شتێك بهێنێ، تاکوو پرس بە ئەو نەکا. [بەویۆنەوە] ئەگەر کەسێك لە ناوچەیەکی هەرە دووری وڵاتدا، بڕوای بە مووسا بهێنایە، ئەو لە جێی خۆیەوە شێت دەبوو.

نە بە پێوە خۆی بۆ دەگیرا، نە بە دانیشتانەوە. هەڕەشەی دەکرد. دایەخوڕی و ئەیوت: ئاخر یارۆ چۆن پێش ئەوەی ئیزن لە من بخوازێ، باوەڕی بە مووسا هێناوە؟!

لە وڵاتی من و سایەی و پەنای مندا دەژی و لێشم یاخی دەبێ؟! ڕۆزی من دەخوا و بەرهەڵستیشم ئەوەستێ؟! من لە خودی خۆیان ـ دانشتوانی میسر ـ بۆیان لە بەر ترم!

فیرعەون نەیدەخستە خۆ کە هەر خۆی لە وڵاتی خوا و، سایە و پەنای خوادا دەژی و لێشی یاخی بووە! ڕۆزی خوا دەخوا و بەرهەڵستیشی وەستاوە!

خوا ویستی لە ناو ماڵی فیرعەون و هەر لە ناو خاوو خێزانیدا نیشانەیەك نیشان بدا.

ویستی بیسەلمێنێ، کە هەر خۆی فەرمانڕەوای بیر و ئاوەزی مەردمە؛ هەروا کە فەرمانڕەوای تەن و لەشیشیانە.

بینوێنێ کە هەر خۆیەتی بەسەر دڵاندا زاڵە، هەروا کە بە سەر زمانانیشا زاڵە.

خوایە کە دەتوانێ ژن و مێرد لە یەك جیا کاتەوە، هەر ئەویشە دەتوانێ ئادەمیزاد و دڵی لێك دوورخاتەوە. باوەڕ چووە ناو ماڵی فیرعەون، کەچی ئەو هەر بە خۆی نەزانی و دەسەڵاتی هیچیشی بە دەست نەبوو.

ژنەکەی باوەڕی بە خوا هێناو بەرهەڵستی فیرعەون وەستا!

مێردەکەی فەرمانڕەوای میسر بوو؛ بەڵام خۆی باوەڕی بە [پێغەمبەریی] مووسا هێنا!

بەڵێ، شارەزاترین مرۆ، لە کار و باری فیرعەون و خۆشەویسترین کەسی فیرعەون، بوو بە شوێنکەوتووی مووسا.

سەرباز و کوێخا دەرگاکانی فیرعەونیش سەرەڕای چاوتیژیی و بۆزەنییان، هیچیان بوو نەکراو هەر بە خۆشیان نەزانی. فیرعەون کە خۆی نزیك‌ترین کەس بوو بە ژنەکەیەوە، پەی بەو ئاڵو گۆڕە هەر نەبرد.

ئەگەر پەیشی ببردایە چی بۆ دەکرا؟! ئەو هەر دەسڵاتی بە سەر تەن و لەشی خەڵکیدا هەبوو، نە بیر و بۆ چوونیان. ئەگەر دەستی بە سەر زمانیشا بچوایە، خۆ دەستی بە سەر دڵدا نەدەچوو. ژن لە سەریەتی بە گوێی مێرد بکا، بەڵام تا کاتێ فەرمانبەریی جیا لە خوا نەبێتە نافەرمانی خوا.

فرزەن، دەبێ فەرمانی داك و باب بەجێ بێنێ، بەڕێزو حورمەتەوە هەڵسو کەوتیان لەگەڵ بکا. بەڵام لە هاوبەش بۆ خوا داناندا مافی

فەرمانبەریی نییە.

«ئەگەر [داك و باب] هەڵیاننای هاوکار بۆ من دابنێی ـکە خۆت هیچی لێ نازانی ـ بە گوێیان مەکە، لە دنیادا بە خۆشی لەگەڵیان بژی و هەر شوێنکەوتووی ئەوانە بە بەرەو من گەڕاونەتەوە. لە ئەنجاما هەر دێنەوە لای خۆم و ئەوسا تێتان دەگەیەنم چ تان کردووە».(١)

ژنی فیرعەون باوەڕی خۆی بە باشی پاراست و لە ماڵی دژمنی خوادا خەریکی پەرستنی خوا بوو.

شەرمی خوای لە دڵدا بوو، و لە دەستی کردەوەی فیرعەون پەنای بە خوا دەبرد.

خواش ڕەزامەندی خۆی بەرامبەر بەو ژنە دەربڕی. لە شەڕی فیرعەون و ئاکاری فیرعەونی ڕزگار کرد. پاشان بە ناو ژنێکی باوەڕ پتەوی کۆڵنەدەر بە خاوەن باوەڕانیشی ناساند.

خوا ژنەکەی فیرعەون بۆ گەلی خاوەن باوەڕان وەك نموونە دێنێتەوە. ئەو لە پەروەرێنی خۆی داوا کرد: «لەلای خۆت و لە بەهەشتا ماڵێکم بۆ دیاری بکە و لە فیرعەون و کردەوەی گەلی ستەمکارانیشم ڕزگار کە».(٢)

## مەینەتی بەرەی ئیسراییل

کاتێ مەردم پەییان بە دژمنایەتی فیرعەون لەگەڵ بەرەی ئیسراییل برد، بە نیازی دژمنی و ئازار دانیان پاڵیاندا بە فیرعەونەوە. [وردە وردە] منداڵانیش

(١) لوقمان: ١٥. (٢) تەحریم: ١١.

بەرامبەر تۆرەمەی ئیسراییل زاتیان شکا و سەگیان تێ هاندەدان.

هەر ڕۆژێ مەینەتێکی تازەیان ئەهاتە ڕێ و هەر ڕۆژێ تووشی بەڵایەك دەهاتن.

مووسا لە پەستا دڵنەوایی دەکردن و خۆ ڕاگریی لێ دەویستن.

پێی ئەوتن: «داوای یارمەتی لە خوا بکەن و خۆراگرن. سەرزەوی هی خوایە و ئەیسپێرێ بەو بەندانەی خۆی مەیلی لێبێ. سەرکەوتنیش بۆ ئەوانەیە کە پارێزگارن».[(1)]

بەرەی ئیسراییل ئەو ئازارانەیان کە دەچێشت، بە مووسایان ئەوت: تۆ نە بەهرەیەکت پێ گەیاندین! نە زیانێکت بۆ جێ بەجێ کردین!

پێیان وت: «پێش هاتنی تۆ بەشمان دەردیسەر بوو، ئێستاش تۆ هەر تووشی دەردیسەرمان دەکەی».[(2)]

بەڵام مووسا نە بێ تاقەتی دەرەبڕی و نەماندووش دەبوو. پێی ئەوتن: «هەروەبزا[(3)] پەروەرندەتان دژمنی لەناو بردن و ئێوەی لەم وڵاتەدا کرد بە جێ نشینی ئەوان؛ تا دەرکەوێ ڕەفتاری ئێوە چۆن دەبێ».[(4)]

هۆزی من! ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوا هێناوە و خۆتان پێ سپاردووە، هەر پشتیش بەو ببەستن.

وتیان: «ئەوا خۆمان بە خوا سپارد: ئەی پەروەردەگارمان! لە شەڕی ستەمکاران بمانپارێزە. لەبەر بەزەیی خۆت لەگەڵی خوانەناسانمان ڕزگار کە».[(5)]

---

(١) ئەعراف: ١٢٨. (٢) ئەعراف: ١٢٩.

(٣) هەروەبزا: هاکا، زۆری نەماوە. (٤) ئەعراف: ١٢٩.

(٥) یۆنس: ٨٦، ٨٤.

فیرعەون نەیدەهێشت بەرەی ئیسراییل بەندایەتی خوا بکەن. کە لە کاتی نوێژ و پەرستنی خوادا دەیبینین بە توندیی لێیان تووڕە دەبوو.

لە سازدانی پەرستگە لە خاکی دا، پیشگیری دەکرد و لە پەرستنی خوا لە وڵاتەکەیدا، ئاڵۆز بوو.

چەند گێل و نەزان بوو فیرعەون! سەرزەوی هی خوایە نە هی ئەو!

ستەمکارتر لەو کەسەی کە رێ نادا لە مڵکی خوادا بەندایەتی خوا بکرێ کێیە؟!

بەڵام فیرعەون نەیتوانی بۆ ئەوەی لە ماڵاندا ئەهێنرایە جێ، رێ لە تاقە کەسێك بگرێ!

خوا بە هۆی مووسا فەرمانی بە تۆرەمەی ئیسراییل دا کە: «با ماڵەکانتان بەرەو رووگە [قیبلە] بن و نوێژیان تیادا بێننە جێ».(١)

فیرعەون و سپاو سانی لە دەستیان نەهات بەرگرێك لە نێوان بەرەی ئیسراییل و پەرستنی خوادا درۆست کەن!

لە دەسەڵاتی کێ دایە بەندە و پەروەرندە لە یەك بکا؟! یا کێ دەتوانێ ببێتە پێشگری نێوان خاوەن باوەڕ و پەرستنی خوا؟!

## برسییەتی

کە فیرعەون یاخی بوو، و خۆ لە بیر کردن و ملەپێچێی گەیاندە ئەوپەڕی، خوا ویستی وشیاری بکاتەوە.

---

(١) یونس: ٨٧.

بێ گومان خوا رازیی نییە بەندەکانی لە راستەڕێ لادەن. هەرگیز حەز ناکا سەرزەوی تووشی دەسدرێژیی و لاڕێیەتی بێ!

فیرعەون کە لە مێشکێکی وای لێ دەرهاتبوو، هیچ رێنموونی و لێزانییەك کاری تیادا نەدەکرد! شتێکی ئاشکراشە، کەر مەگەر بە لێدان ملی رێگا بگرێ.

خوا ویستی فیرعەون داچڵەکێنێ!

[وتمان کە] میسر وڵاتێکی رەنگین و رازاوە بوو. مەڵبەندی نیعمەتی جۆراو جۆر و میوە و دەخڵ‌ودان بوو. دەزانن میسر لە رۆژگاری برسییەتی و سەردەمی یۆسفدا چۆن یارمەتی وڵاتە دوورکەوتوەکانی دەدا؟ چۆن بە دەم دانیشتوانی شام و کەنعانەوە هەبوو!

نیل کە بە سەر خاکی میسردا سوارە؛ دەشت و مەزرایان تێراو دەکا و سەرچاوەی خێر و بەختەوەریی ئەو وڵاتەیە. فیرعەون و خەڵکی میسر، نیلیان بە کلیلی رزق و بژیو لە قەڵەم دەدا.

لایان وابوو میسر لە پەنای نیلدا نە هەرگیز ئاتاجی باران دەبێ و نە هیچی تریش.

بێ ئاگابوون لەوەی کلیلی رزق و بژیو لە دەستی خوادایە. «خوایە کە بە لێزانی خۆی رۆزی هەرکەسێك زۆر یان کەم دەکا».[1] نیلیش هەر بە فەرمانی خوایە کە زۆر دەبێ و رێ دەپێوێ! یا کەم دەکاو کەڵکی لێ هەڵناسوورێ.

(١) رەعد: ٢٦.

خوا فەرمانی بە نیل دا ئاوەکەی بداتە خوارەوە و بڕوا بە زەویدا.

ئەمجا ئیدی باخ و مەزرای میسر، بە چی ئاو دێری بکرایە!

میوەی ڕەنگاو ڕەنگی باخەکانیان وەکوو جاران نەما! دەخڵو دانیان ـبەرەبەرەـ کەمی کرد، برسییەتی لە شوێن برسییەتی!

فیرعەون و هامان و لەشکریشیان دەستەپاچە داکەوتن. لێرەدا بۆ خەڵکی میسر دەرکەوت کە پەروەرندەی ئەوان فیرعەون نییە و رزق و بژیو هەر لە دەستی خوادایە! بەڵام ئەم راستییەش قازانجێکی وای بۆ فیرعەون و میسرییەکان نەبوو و داینەچڵەکاندن!

شەیتان ببوو بە بەرگرێك لە نێوان ئەوان و ئامۆژگاریی و پەند وەرگرتن‌دا.

ئەیانوت: هۆی ئەم برسییەتی و کەم ئاوییە، شوومی مووسا و هۆزەکەیەتی!

بڕوای سەیر ئەمەیە! ئەی بۆچی مووسا بەر لەو ساڵانە نەبوو؟! یان بەرەی ئیسراییل لە مێژەوە لە میسردا نەبون؟!

نەخێر؛ هۆی ئەو بەڵایە شوومی کردەوەکانی خۆیان بوو!! ئاکامی خوا نەناسی و دڵڕەقییان بوو!

فیرعەون و دارودەستەی ڕەقەبەرێیان زۆری سەند و وتیان: «ئێمە سەر بەم جادووە، ناسپێرین؛ هەر دیاردەیەکمان بە مەبەستی جادوو لێکردن بۆ بهێنی، هەر بڕوات پێ ناهێنین».(١)

---

(١) ئەعراف: ١٣٢.

## پێنج دیاردە

خوا دیارەیەکی تری بۆ خستنە روو.

بارانی بە سەرابارانـدن و نـیل کـەوتەوە سـەر رێژی. ئـاسمان بـارانـی دارشت. هەر لە پەستا باری هەتا باخ و مەزراکان چوونە ژێر ئاوەوە. میوە و دەخڵو دان هەموو لە ناو چوون و باران بوو بە بەڵایەك بۆ گـیانیان. ئـەگـەر زووتر داد و هاواریان بۆ کەم ئاویی بوو، ئەمجارە ئاه و ناڵەیـان لە دەست زۆریی ئاو بوو.

پاشان خوا کولەی بۆ بەرێ کردن و بەرهەمی باخ و مەزاری پـێ لە نـاو بردن. نشتن بە دارەکانەوە و بە تەواویی رووتاندنیانەوە.

سپاو لەشکری فیرعەون دەرەقەتی لەشکری خوا نەهاتن. چۆنیان شەڕ لەگەڵ کردایەن، نە شیر[1] کاری لێ دەکردن و نە تیریش؟

لێرەدا خــەڵکـی مـیسر دامـاویی هـامان و فـیرعەون و بـێدەسـەڵاتـی لەشکریان بۆ روون بووەوە.

بەڵام بەمەش رانەچەنین!! ئەمەش وریای نەکردنەوە!! لەم سەرو بەندەدا خوا لەشکرێکی تری هەنارده سەریان، کە ئەویش چۆرێك ئەسپێ [سوون] بوو.

ئەم ئەسپێیانە، هەر بە تەواویی تەنگیان لێ هەڵچنین، پەنا بەخوا!

ناو رایەخ و پێخەف و جلو بەرگ و سەر و قژیان هەموو بوو بە ئەسپێ.

---

(١) شیر: شمشێر.

خەویان لێ هەڵگیرا. شەویان بە دەم کوشتن و تیا بردنی ئەم گیان لەبەرانەوە ئەدایە سەر، تا رۆژیان لێ دەبووەوە. چۆنیان بەربەرەکانێ لەگەڵ ئەسپێ بکردایە، نە شمشێر چاری دەکردن، نە گوللە. سپاو لەشکریش هیچ چەشنە یارمەتییەکیان لە دەست نەدەهات پێیان بکەن؟

دوای ماوەیەکی‌تر خوا جۆرێ قرپۆقی کرد بە مێملیان.[1] بە جۆرێکی وا کە خواردن و خواردنەوە و جل‌و بەرگیان هەموو پڕ بوو لە قرپۆق.

قرپۆقان زۆریان بۆ هێنان و ژیانیان لێ تاڵ کردن. وەها بڵاوەیان کردبوو، لە هەر کون و کەلەبەرێکی ماڵاندا هەبوون.

ئەم ئەی واقاند؛ ئەو رادەپەڕی؛ ئەوی‌تر بازی دەدا. کە یەکێکیان لێ دەکوژرا دە دانەی‌تر ئەهاتەوە جێی! ئەگەر یەکێکیان لێ فڕێ دەدرا، پێنجی‌تر لە جێیدا سەوز دەبوون. پێت وابوو هەر لە ناو ماڵەکەدا زاوزێ دەکەن! سەرباز و پاسەوانانیش لە بەرامبەر قرپۆقەوە داماو داکەوتبوون.

دوای هەموو ئەوانە، خوا ئاوقەی بەڵایەکی دیکە واتا لووت پژانی[2] کردن.

[یانی:] بە هۆی بەر بوونی خوێنی لووت، لاواز و کەم هێز دەکەوتن. نە پزیشك چاری دەکردن؛ نە دەرمان بەهرەی پێ دەگەیاندن. کاتێ بەڵایەکیان دەدی، بە مووسایان ئەوت: مووسا! لە پەروەردگارت وەپاڕێ ئەم بەڵایەمان لە کۆڵخا؛ ئەوسا ئێمە بەرەو خوا دەگەڕێنەوە. باوەڕ ئەهێنین و بەرەی ئیسراییلت لەگەڵ دەنێرین.

---

(١) مێمل: بەرهەڵست، دژ.

(٢) لووت پژان: خوێن بەربوونی لووت.

بەڵام کە خوا لە تەنگانەی رزگار دەکردن، سەر لە نوێ پەیمانەکەیان دەشکاندەوە.

«ئەوجار ئێمە، [بەڵای] لافاو و کولە و ئەسپێ و خوێن [بەربوون] و بۆقمان هەناردە سەریان. بەڵام ئەوان دەمارگرژیان نواند؛ چوون کۆمەڵێکی تاوانکار بوون».(١)

## چوونە دەرەوە

وڵاتی میسر بۆ تۆرەمەی ئیسراییل تەنگ و تەسکەوە بوو. میسری پڕ خێر و بێر، ئیتر چ کەڵکێکی بۆ ئەوان هەبوو وەختێ لە زیندانێکا دەژیان، شەو و رۆژ بە شێوازی جۆراو جۆر، ئازار دەدران و سووکایەتییان پێ دەکرا؟!

تاکەی هەڵیان کردایە، مەگەر لە جنسی ئادەمیزاد نەبوون، ئێش و ئازاریان هەست پێ نەدەکرد؟!

خوا بە مووسای راسپارد، لە ناخی شەودا، هاوڕێ لەگەڵ بەرەی ئسراییل بکەونە ڕێ و لە میسر وەدەرکەون.

سەربازانی چاو تیژ و بۆزەن، بەوکەین و بەینەیان زانی و هەواڵەکەیان بە فیرعەون گەیاند.

مووسا و بەرەی ئیسراییل داجوین و روویانتا لە سەرزەمینی پیرۆز. ئەوان تێکڕا دوازدە دەستە بوون، کە هەر دەستە سەرگەورەیەکی بۆ خۆی هەبوو.

---

(١) ئەعراف: ١٣٣.

ڕێگەیان بەرەو شام و ڕێگەیەکی دیاریی کراو بوو. وشکانیەك لە نێوان دوو وشکانیدا؛ کە مووسا خۆی دوو جاران پیادا ڕۆیشتبوو.(١)

بـەڵام مـووسا بـۆ خـۆی مـەبەستێکـی هـەبوو، خـوا مـەبەستێکـی‌تر. ئەنجامیش بە باری مەبەستی خواداگەڕا. مووسا ڕێگەی هەڵە کرد و ئەو بە هەڵەدا چوونەشی گەیاندییەوە بە مەبەستە [تەقدیرە]کەی خوا.

مووسا لای وابوو، لەگەڵ بەرەی ئیسرائیلدا بەرەو باکـوور(٢) دەچـن. بەڵام لە تاریکی شەودا هاوڕێیانی بەرەو ڕۆژهەڵات بـردبوو. واتـا: لەگـەڵ دەریای پڕ شەپۆلی سووردا ڕوو بە ڕووی کردبوون! [لەوێدا کـەوتنە لاڵە و نزا:] ئەی پارێزگار! ئەی پەنادەر! ئێمە لە کوێ داین؟ جـواب بـوو بـەوە: لە قەراخی دەریادان!

کاتێ سەرنجی پشت سەری خۆیان دا، تەپ و تۆزێکیان بـەدی کـرد! لەشکرێکی زۆر و زەبەند ئاسۆیان تەنی بوو!

لە نـاکـاو قـیڕە و هـەرا بـەرزەوە بـوو: ئـاخر کـوڕی عـیمران! ئـێمـە چ خراپەیەکمان لەگەڵ کردبووی، تۆ ئاوا پیلانی لە ناوبردنت بۆ دارشتین!

هێنامانتە گوێی دەریا با فیرعەون بمانکوژێ. ئەوەتا وەکـوو مشك ڕێی هەڵاتن و خۆ دەربازکردنمان لێ بڕاوە!

خۆ ئێمە هەرگیز بە خراپ ناومان نەبردووی، ئائەمە تۆڵەی چییە لێمانی دەستێنیتەوە؟!

---

(١) جاری یەکەم بەوێدا چوو بۆ مەدیەن و جاری دووەم گـەڕایـەوە بـۆ مـیسر. «نووسـەر».

(٢) باکوور: شیماڵ.

بەوە وازت نەهێنا، ئـەو هـەموو گـرفت و مـەینەتانەت تـووش کـردین، سەرەنجام کێشامانتە ئێرە؟!

ئەوەتا بەردەممان دەریایە و پشت سەرمان دژمن؛ هیچ رێگەیەکمان نییە مەرگی لێ بەدەرا!

لێرەدا تەواوی دنیا لە بەرچاوی بەرەی ئیسراییل تاریك بوو. چـاوانـیان زاقەوە ببوو. بە تەواویی هەشەکەیاندا وکەوتنە چپە و سرتە. هەموو بەجارێ دڵیان نشتبوە لەرزە. نـزیك بـوو کـێوە بـەرز و داکـوتراوەکـانیش لە تـرسانا راتەکێن.

بەڵام ئەو باوەڕەی مووسا بە پەروەرێنی خۆی هەبوو رێی نەدا ترسی بە دڵیدا بێ.

ئەو خەڵکە ئا لەو کاتەدا دەنگێکیان هاتە گوێ کە شکۆی پێغەمبەریی بە باشی تێدا هەست پێ دەکرا.

«نە، مەترسن. من پەروەرندەم لەگەڵایە، هەر بەم زوو دەروویەکـم بـۆ دەکاتەوە».(١)

خوا فەرمانی بە مووسا دا، بەگۆچانەکەی لە دەریاکە دا. کە لێی دا، دەریا قڵەشا و ئاو لە هەموو لاوە چەشنی کێو لە جێی خۆدا راوەستا.

دوازدە رێگا [کورووشە دۆڵ]ی(٢) تیادا دروست بـوو. واتـا: بـۆ هـەر دەستەیەك رێگایەك.

---

(١) شوعەرا: ٦٢.

(٢) کورووشەدۆل: دۆل، شیوی تەنگ و باریک.

ئـەمجا مـەردم، بـێوەی، پەڕینەوە و بـەسەلامەت گـەیینە قـەراخـی دڵنیاکەرەوەی دەریاوە.

## چوونە ژێر ئاوی فیرعەون

فیرعەون چاودێری بەرەی ئیسراییل بوو کە چۆن لە دەریا پـەڕینەوە و ئاسوودە گەیشتنە ئەوبەڕ.

بە سەربازانی وت: جا سەرنجی دەریا دەن چۆن بە فەرمانی من دەمی کردووەتەوە، کە ئەو هەڵاتووانە بگرێ.

پاشان کەوتە بەر لەشکرەوە و ملینا.

تۆرەمەی ئیسراییل دیسان هاواریان لێ هـەستایەوە: ئـاها دژمـن، ئـاها ستەمکار! خەریکە لە دەریا تێدەپەڕێ و دێ بە دوامانا!

تازە هیچ هۆیەك ناتوانێ ئێمەی لە دەست رزگارکا. هەر ئێستا ئەمانگاتێ. یا بە دیلی و سەر شۆڕیی ئەمانباتەوە میسر، یان هەر لەم بیاوانەدا، غەریب و بێ کەس ئەمانکوژێ.

مووسا ویستی بە گوچانەکەی لە وشکانی دەریا بدا، کە وەکوو خۆی لێ بێتەوە. بەڵام خوا تێی گەیاند: «ئاسوودە لە دەریا بپەڕەوە؛ چوون ئەو لەشکرە دەخنکێ».(١)

هەرکە فیرعەون و سەربازانی گەیشتنە پـانایی دەریـا [کـە وشك بـوو]، ئاوەکە بە سەریانا هاتەوە یەك.(٢)

---

(١) دوخان: ٢٤.

(٢) تـەڵە ئـاوە، زیـتە چـێوە نەچیر دەرچوو، سەگ بوو پێوە «وەرگێر».

وەختێ فیرعەون پەی بەراستی برد، جاسەرمەستی لەسەر پەڕی. «کاتێ دیتی خەریکە ئەخنکێ وتی: باوەڕم هەیە کە بە راستی کەس بۆ پەرستن ناشێ ئەو کەسەی لێ بەدەر تۆرەمەی ئیسراییل بڕوایان پێ هێناوە».(١)

بەڵام بێ خۆیە: «پەشیمانی ئەوانە هیچ ناژی، کە بە درێژایی تەمەن خەریکی گەندەکاریین و وەختێ یەکێکیان لێ کەوتە گیانکەنشت، بڵێ ئەوا پەشیمان بوومەوە».(٢)

«لەو رۆژەدا کە یەکێ لە نیشانەکانی خوایان نیشان بدرێ، ئەو کەسەی بەر لەوەی بڕوای نەهێنابێ و کردەوەی چاکی نەبووبێ، باوەڕ هێنان تازە بەهرەیەکیان پێ نادا».(٣)

پێی وترا: «تازەو دوا؟ تۆیە کە تا ئێستا یاخی بووی و لە ریزی ستەمکاراندا بووی؟»(٤)

فیرعەون لە دەریادا خنکاو قاڵی بڕایەوە.

تیاچوو، ئەو ستەمکارەی هەزاران پیاو و منداڵی بە کوشتن و خنکاندن لە ناو بردبوو.

فەوتا ئەو لە خۆ بایەی هەزار کەسی بە جەزرەبەی درێژ خایەن، یان سێدارە، فەوتاند بوو.

بەڵێ، پاشای میسر لە دووری دوورەوە، بە عەزرەتی بینینەوەی کۆشك و تەخت و دەسەڵاتەکەی تووناو توون بوو. نە پزشکێك هەبوو دەرمانی کا، نە ئاواڵێك خەمی بۆ بخوا و نە چاوێکیش لە بۆی بگری.

---

(١) یۆنس: ٩٠. (٢) نیساء: ١٨.

(٣) ئەنعام: ١٥٨. (٤) یۆنس: ٩٢

بەرەی ئیسراییل بڕوایان بە مەرگی نەدەکرد. ئەیانوت: فیرعەون مردنی بۆ نییە. مەگەر ئێمە خۆمان شایەت نین کە بۆ ماوەی چەند رۆژان خواردن و خواردنەوەی لە خۆ دەگرتەوە [کەچی هەر دەشما]؟!

دەریا لاشەکەی خستە سەر ئاو، جا لە مردنی دڵنیا بوون. خوابە فیرعەونی فەرموو: «ئەمڕۆ لاشەکەت دەخەینە سەر دەریاوە کە ببیە پەند بۆ ئەوانەی لە پاش تۆ دێن».(١)

بەڵێ، لاشەی فیرعەون نیشانەیەك بوو، بۆ بینەران و پەندێکیش بۆ ئەوانەی پەند وەرگرن.

لەشکری فیرعەونیش سەرپاکیان چوونە ژێر ئاو و تاقی زیندوو نەمایەوە.

میسریان لە شوێن جێماو، لە خاکی پان و بەرینی ئەو وڵاتە بەشی جێ قەبرێکیان پێ نەبڕا کە تیایدا بنێژرێن.

«زۆرێك باخ و کانی و چەند مەزرا و جێو شوێنی پڕ خێر و بێرمان لە پاش جێما، کە تیادا بە خۆشی رایان دەبوارد!. ئێمە بەو جۆرە دامان بە گەلێکی‌تر؛ نە ئاسمان بۆیان گریا، نە زەوی و نە دەرفەتێکیشیان پێ درا».(٢)

## لە وشکی‌دا

[سەرەنجام] بەرەی ئیسراییل گەیینە سەر وشکانی پڕ لە ئارامش. ئەوانیش وێنەی دەسەڵاتدارانی سەربەست لە ناخی ئەو هەوایەدا پشوویەکیان دا.

---

(١) یۆنس: ٩١.　　(٢) دوخان: ٢٩، ٢٥.

لەوێدا ئیتر، نە ترسی فیرعەونیان لە دڵدا هەبوو؛ نە هی هامان و نە سەربازانیش.

ئاسوودە و دڵنیا ئەهاتن و ئەچوون. جگە لە خوا باکیان لە کەس نەبوو.

بەڵام چوون ئەوان پەروەردەو هۆگری شار بوون، لەو بیاوانەدا تیشکی خۆر ئازاری دەدان.

ئەوان لەوێ میوانی خوا بوون. نەت‌بیستووە پاشایان، لە مێوانانی خۆیان چۆن رێز دەگرن؟!

چادریان بۆ هەڵدەدەن و لە تینی خۆریان دەپارێزن؟!

ئاشکرایە جوامێری خوا باترین جوامێرییە و خوا لە هەموو کەس رێزگرترە!

[ئەوەتا] فەرمانی بە هەوران دا سێبەریان بۆ بکەن، با لە سێبەری هەوردا رێ ببڕن. لە وەختی رۆیشتنیانا، هەوریش ئەرڕۆیشت و کاتی وەستانەوەشیان رادەوەستا.

بەرەی ئیسراییل توونیەتی زۆری بۆ هێنان و ئاویش لەو بیاوانەدا دەست نەدەکەوت. نە چۆم و جۆبارێکی لێ‌بوو نە چاوانەیەکیش.

چوون بۆ لای مووسا و لە دەست توونییەتی سکاڵایان دەست پێ کرد. چەشنی منداڵ کە چۆن هانا دەباتە بەر دایکی و دەستەو دامانی دەبێ.

مووساش لە پەروەرندەی پاڕایەوە! کێی شك دەبرد جگە لەو؟!

خوا پێی فەرموو: «دە بە گۆچانەکەت لەو بەردەی دە! [کە لێی دا] دوازدە کانی لێ هەڵقوڵی، هەر دەستەیەك جێی ئاوخواردنەوەی خۆی دەزانی».(١)

---

(١) بەقەرە: ٦٠.

پاشان برسییەتی تەنگی بە تۆرەمەی ئیسراییل هەڵچنی. بەرۆکی مووسایان گرتەوە؛ وێنەی منداڵان کە بەرۆکی دایکیان دەگرن و یارمەتی لێ دەخوازن.

ئەمجارە وتیان: تۆ لە وڵاتی پڕ خێر و بێر و پڕ لە باخات و بژیوی میسرت دەرپەڕاندین؛ دەجا ئێستە لەم بیاوانەدا کێ بژیومان ئەداتێ؟

مووسا پەنای بردەوە بەر پەروەرێنی! کێی‌تری هەبوو ئەوی لێ بەدەر؟! خوا رۆزی بۆ بەڕێ کردن.

بژیوێکی چەشنی هەڵوای بۆ باراندنە سەر گەڵای دارانەوە. پەلەوەرێکیشی بۆ هەناردن، کە بە سەر لق و چڵی دارانەوە بە ئاسانی بۆیان دەگیران.

ئەو دوو خۆراکە بریتی بوون لە مەلی شێلاقە و گەزۆ کە خوا لە بیاواندا بەوانە پەزێرایی لەگەلی ئیسراییل کرد.

## سپلەیی گەلی ئیسراییل

گەلی ئیسراییل بە هۆی کۆیلایەتی و ژێر چەپۆکی درێژخایەن، رەوان و ئاکاریان تێك‌چوو بوو.

چەشنی منداڵ هەر ساتێ خوازیاری شتێك و هەر دەمێ لەسەر بەزمێك بوون.

مەردمێکی بێ سفەت و پر سکاڵا و دڵناسکیان لێ دەرهاتبوو. هەر چییان لێ قەدەغە دەکرا، لە بەرچاویان شیرین دەبوو. چیشیان پێ ئەدرا بە لالووتەوە بۆیان دەڕوانی.

زۆری پێ نەچوو بە مووسایان وت: ئێمە ئەم خۆراکە تەنیایە و ئەم هەڵوا وگۆشتەمان بە تەواوی لێ بێزراوە. ئیشتییامان لە سەوزەوات و دانەوێڵەیە.

«مووسا! ئێمە بە یەکجۆر خواردنەوە نامانکرێ. لە پەروەرندەت وەپاڕێ لەوەی زەوی شینی دەکا، وەکوو سەوزەوات و خەیار و سیر و نیسك و پیواز بۆمان بەرهەم بێنێ».[(١)]

مووسا لەم داخوازییە سەیرەیان بەحتەوە بوو.

بەدەنگێکی تێکەڵ بە دژایەتی و سەرسامی و بە گڕا چوونەوە وتی: «[باشە] ئێوە چاك بە خراپ دەگۆڕنەوە؟!»[(٢)] دانەوێڵەو سەوزەوات ئەنێنە جێی ئەو گۆشت و هەڵوایە کە دەستی دەستداران ناکەوێ؟!

ئایا خۆراکی وەرزێران جێی خۆراکی پاشایان دەگرێتەوە؟

هەست و سۆزێکی چەند بێفەڕ! بۆ چوونێکی چەند ناحەز! بەڵام بەرەی ئیسراییل دەست هەڵگری داخوازەکەیان نەبوون. بێپسانەوە دانەوێڵەو سەوزەواتیان لە مووسا دەخواست. مووسا پێی وتن: «ئەوەی ئێوە داوای دەکەن لە هەر شار و دێیەکا هەیە. بۆ خۆتان بچنە شارێك، دڵخوازەکەتانی تیادا دەست کەوێ».[(٣)]

## دژایەتی بەرەی ئیسراییل

بەرەی ئیسراییل چووبوونە سەر ئاکاری منداڵان. چەشنی منداڵی لاسار، چییان پێ فەرمان ئەدرا، بەرهەڵستی ئەوەستان و دەستیان ئەدایە

---

(١) بەقەرە: ٦١.	(٢) بەقەرە: ٦١.

(٣) بەقەرە: ٦١.

گاڵتە پێ کردنی.

وەك بڵێی بە لازمیان دەزانی، هەر چییان پێ ئەوترا پێچەوانەی بکەنەوە.

عەینی منداڵی لاسار، کە پێی بڵێین هەستە دانیشێ؛ بڵێین دانیشە، هەڵسێتە سەر پێ. بڵێین بێدەنگبە، قسە بکاو بڵێین قسە بکە، دەم قونجێنێ.

جگە لە رکەبازیی منداڵان، ناپاکی تاواناکار و سووك بۆ روانینێکی دژمانە و گێل گەوجییەکی شێتانەشیان تیادا دەبینرا.

هەر بە ئاوات بوون بچنە شارێك و خواردنیان ببێتە ئەو دانەوێڵە و سەوزەواتەی بە عەزرەتی بوون.

پێیان وترا: «بچنە ناو ئەم شارەوە هەرچی دەخۆن و دەخۆنەوە ئارەزووی خۆتانە. هەر لە دەرگاکەی وەژوورکەوتن سوژدە بەن و بڵێن: پەروەرندەمان! ئەرکی قورسمان مەخە سەرشان؛ ئەمجا ئێمە لە گوناهەکانتان دەبوورین و پاداشی چاکەکارانیش زۆرتر دەکەین». (١)

لەم فەرمانەی خوا رکیان هەستا و بە نا بەدڵی و گاڵتە کردن و قنگەخشێ چوونە ناو شارەکەوە.

«لە رێ لادەران چییان پێ وترا بوو، بە پێچەوانەکەی رەفتاریان دەکرد». (٢)

سەرەنجام، خوا بەڵای بۆ گەیاندن تووشی نەخۆشی وەبای کردن، تا وەکوو مشك هاتن بە لادا.

کاتێ فەرمانێکیان پێ ئەدرا، لە پەستا پرسیاریان لە بارەوە دەکرد و

(١) بەقەرە: ٥٨.    (٢) بەقەرە: ٥٩.

بێزارییان لێ دەردەبڕی. چەشنی کەسێك حەز لە ئەنجامی کارێك نەکا و بە پرسیاران بێ مەیلی خۆی لێ دەربڕێ.

لە ناو بەرەی ئیسراییلدا کابرایەك کوژرا و ئەوان ئەم ڕووداوەیان زۆر پی گران بوو. چوون لێشیان ڕوون نەبوو کێ کوشتوویەتی، تەقالا بۆ دۆزینەوەی کوژەر، بوو بە کێشەیەکی کۆمەڵاتی.

چوون بۆ لای مووسا و پێیان وت: ڕاسپاردەی خوا! لەم کێشەیەدا یارمەتیمان بدە و لە پەروەرندەت داواکە، ئەم کوژەرەمان پێ بناسێنێ.

## مانگا

مووسا لە خوا پاڕایەوە. ئەویش فەرمانی پێ دا، بە گەلی ئیسراییل بڵێ، بۆ ڕوون بوونەوەی کارەساتەکە مانگایەك سەربڕن. بەرەی ئیسراییل شانیان کرد بە پرسیاری یەك لە شوێن یەك و گەمە و گاڵتەدا.

کاتێ مووسا وتی: «خوا فەرمانی پێ داون مانگایەك سەربڕن، لە جوابدا وتیان خەریکی گاڵتەمان پێ دەکەی؟

مووسا وتی: بە خوا پەنا دەبەم لەوەی بچمە ریزی نەزانانەوە [گاڵتە بە خەڵکی بکەم]».(١)

ئیتر شانیان پیاکرد. وتیان: «لە پەروەرندەت وەپاڕێ، بۆمان ڕوون کاتەوە چۆن مانگایەکە؟ وتی: ئەفەرموێ: مانگایەکە، نە ئەوەندە پیرە و نە جوانیشە، ناوەنجییە. چۆنتان فەرمان پێ دراوە، بیهێننە جێ».(٢)

---

(١) بەقەرە: ٦٧.　　(٢) بەقەرە: ٦٨.

بەمەوە خۆیان بۆ نەگیرا و پرسییان بۆ رەنگی مانگاکە. وتیان: «لە پەروەرندەت بخوازە رەنگەکەیمان پێ بڵێ.

مووسا پێی راگەیاندن: پەروەردگار ئەفەرموێ: مانگایەکی زەردی وەهایە، کە چاوپێکەوتنی مرۆ خوشحاڵ دەکا»[١].

کە پرسیاریان نەما، یەکێکی تریان تاشی. وتیان: «لە پەروەرێنت بپارەوە، با جوان تێمانگەیەنێ چۆنە. چۆنیەتی ئەم مانگایە سەری لێ شێواندووین. ئەگەر خوا مەیلی لێبێ ئەمجا دەزانین چ بکەین.

وتی: ئەفەرموێ: نە راهاتووە جووت بکا و نە ئاویش دەکێشی بۆ زەوی. لەکە و پەڵەشی پێوە نییە».[٢]

لێرەدا وەستانەوە. چوون وتیان: ئەگەر خوا حەز بکا ئێمە پەیمان بە راستی بردووە.

کەوتنە سەر راستەڕێ. بەڵام دیسان پرسیاری یەك لە دوای یەك تەنگی پێ هەڵچنین.

ئەگەر مانگایەکیان سەر ببڕیایە، بە ئامانجی خۆیان دەگە یشتن. بەڵام ئەوان خۆیان دڵ پەنگاو کرد و خواش دڵ پەنگاوتری کردن.

کەوتنە تەقالا بۆ دۆزینەوەی مانگایەکی زەردی، رەنگ رۆشنی ناوەنجی، کە نە جووتی کرد بێ و نە ئاویشی بۆ زەوی کێشا بێ.

دیارە مانگایەکی وەها شتێکی بەلاجەوییە. چوون مانگا یا پیرە یا جوان. هەشە ناوەنجی بێ، بەڵام زەرد نییە. ناوەنجی زەردیش پەیدا دەبێ، بەڵام

---

(١) بەقەرە: ٦٩.    (٢) بەقەرە: ٧١، ٧٠.

ڕەنگی ڕۆشن نییە. مانگای ناوەجی زەردی ڕۆشنیش دەسدەکەوێ، بەڵام ڕامی زەوی کێڵە. هی واش هەیە ناوەنجی زەردی ڕۆشنە و زەویش ناکێڵێ؛ بەڵام لەوانەیە مەزرا ئاو دەدەن.

گەڕان و هەر گەڕان، تاکوو خۆیان بە ئاکامی ئەو چنۆکییەیان پەیان برد. خۆی چۆنە؟ ئەی ڕەنگی چۆنە؟ چۆن چۆنیە؟ بە تەواویی وەڕەز بوون.

خوا حەزی کرد قازانجێک بە منداڵێك [کوڕێك]ی بێباوك بگەیەنێ. ئەو مانگایە خۆی ناونیشانی دابوو، لە لای ئەو کوڕە دەستیان کەوت. «بە پارەیەکی زۆر زەبەند، لێیان کڕی و پاشان سەریان بڕی. کە نزیك بوو ئەو کارەش نەکەن».(١)

خوا فەرمانی دا، بە تیکەیەك لە گۆشتی ئەو مانگایە لە کوژاوەکە دەن، تا گیانی تێ بێتەوە و ناوی کوژەرەکەیان پێ بڵێ. ئاکامیش هەروا بوو.

## دەستوور [قانوون]

گەلی ئیسراییل لە ژیانی حەیوانی ڕزگار بوون و گەیشتن بە ژینێکی شایانی ئادەمیزاد.

لە بیاوانا وێنەی دەسەڵاتدارانی ئازاد، ڕۆژ و شەویان ئەدایە سەر. بەو بۆنەوە ئاتاجی دەستوور و بەرنامەیەکی خوایی بوون، کە هەم ڕاستەڕێی ژیانیان نیشان داو هەم داوەریشیان لە نێواندا بکا.

مرۆ، کاتێ دەتوانێ مرۆیانە بژی، بە پێی دەستووری خوایی و ڕێنموونی

---

(١) بەقەرە: ٧١.

پەروەردگار کارو باران بەڕێوە بەرێ.

جیهان تاریکستانە، ئەگەر رۆشنایی ئەوانە نەبێ کە لە پەروەرێنیانەوە پێیان گەیشتووە.

ئەو رۆشناییە رۆشنایی پێغەمبەرانە، کە مرۆ راستەڕێی پێ ئەدۆزێتەوە.

ئەوەی بەم رۆشناییە شارەزای رێ نەبووبێ، لە رێ لادەرێکە چێو لە تاریکی دەکوتێ.

بڕوا بە رۆشناییەکی جیا لەمە، بڕوایەکی نابەجێ و دوور لە ئاوەزە.

خۆ لە بیر و باوەڕی هاوبەش دانەر و جوولەکە و گاور و ئەفسانەکانیان تێگەیشتوون، کە چۆنە؟!

دە زانستیش [بە تەنیایی] نەزانییە؛ دەمبڕکارییە، گومانە. «ئەوانە هەر وەدوای گومان دەکەون؛ گومانیش جێی راست ناگرێتەوە».(١)

ئەخلاق [لە ئایین و بڕاو]یش، شتێکی دامەزراو نییە. واتا: دەمێ بەرەو کزیی دەچێ؛ دەمێ سەر رێژیی دەکا. نەت دیون ئەوانەی شوێنکەوتووی پێغەمبەران نین، چۆن مافی خەڵکی دابڕ دەکەن؟! چۆن لە بڕەو سنوور، تێ دەپەڕن و دەبنە بەندەی هەواو هەوەس؟!

دەستوور و بەڕێوبەرایەتی [دوور لە ئایین] ملهوڕیی و دەس‌درێژییە بە سەر گیان وماڵی خەڵکیدا.

بەرپرس و فەرمانڕەوایانت نەدیتووە ـ لەوانەی خوا ناناسن و لە ئایین بڕاون ـ چۆن هیچ رێزێك بۆ ئامانەت دانانێن و ماڵی خوا و گیانی مەردم و

(١) نەجم: ٢٨.

مافی مەردم پێ شێل دەکەن؟!

لە مەردمیان دەویست بەندایەتییان بکەن، دەستە دەستەیان دەکردنەوە، پاشان پیاوەکانیان ئەکوشتن و ژنانیان ئەهێشتنەوە؟!

بیستووتە لە شەڕی [جیهانی] یەکەم و دووەمدا چەندە مەردم کوژران؟![1]

دیارە دانیشتوانی جیهان ـ ئەوانەی لێ بە دەرکە پەروەرندە ڕۆشنایی پێ بە خشیون ـ لە ناو تاریکایەکی پڕ بە پردان.

تاریکی لەسەر تاریکییەکە [کە ئەگەر کەسێ] دەستی دەربێنێ لە وانەیە نەیبینێ. ئەوەی خوا ڕۆشنایی پیشان نەدا، ڕۆشنایی شك نابا.[2]

پێغەمبەرانن کە مەردم لە چۆنیەتی ئایین و چۆنیەتی ژیان تێدەگەیەنن. چۆنیەتی خواردن و خەوتن و هەستان و دانیشتنی ناو کۆمەڵیان پێ فێر دەکەن.

پێغەمبەران وا مەردم ڕادەهێنن، کە باوکێکی دڵسۆز جگەرگۆشەکانی بۆ ژیان پەروەردە دەکا.

ئادەمیزاد چەشنی منداڵ، پتر لەوەی لە سەردەمی منالییا نیازی بە ڕاهێنانی داك و باب هەبێ، لە گەورەییدا ئاتاجی ڕێنموونی پێغەمبەرانە.

---

(١) بەپێی لێکۆڵینەوەکانی «ئەلیس تاونسند»ی سیاسەتزانی ئینگلیسی، ژمارەی بریندارانی شەڕی جیهانی یەکەم پتر لە سی و حەوت ملوێن کەس بوون کە (٨٥٤٣٥١٥) کەسیان تێداچوون. دیسان بە وتەی میستێر «میکستن»ی ئینگلیسی هەژماری زامدارەکانی شەڕی جیهانی دووەم لە پەنجا ملوێن تێپەڕی. «نووسەر».

(٢) نوور: ٤٠.

ئەوانەی دەستوور و بەرنامەی ئاسمانییان پێ نەگەیشتووە، و ئاکاری پێغەمبەرانیان فێر نەکراوە وەکوو داری وشکەڵان، تەنیا بەریان، لار و گێڕیی و دڕك و داڵە.

## تەورات

خوا مەیلی لێ بوو هۆزی ئیسراییل وەکوو ئەو گەلانەی بە هۆی بێ ئاگایی لە پەیام و ڕێنموونی خوا تیاچوو بوون، لەناو نەچێ. ئەوانیش چەشنی ئەو نەتەووانە ڕێی هەڵە نەگرنە بەر و چێو لە تاریکی نەکوتن.

بەوبۆنەوە فەرمانی بە مووسا دا سی ڕۆژان ڕۆژوو بگرێ. پاشان بڕوا بۆ «تووری سینا»، کە پەروەرندەی گفتوگۆی لەگەڵ بکاو پەیامێکی بداتێ، بیکەن بە ڕێپیشاندەری خۆیان.

چوون گەلی ئیسراییل گەلێکی باوەڕ نەکەر بوون، مووسا حەفتا پیاوی لە ناو هۆزەکەیا هەڵبژارد، کە شایەتی مەسەلەکە بن. مووسا بە هاروونی برای وت: «تۆ لەباتی من لە ناو هۆزەکەمدا بە. کارو بار ڕێك و پێك بکە و دوای خراپکاران مەکەوە».(١)

چوون ئاشکرایە کە کۆمەڵ، نیازی بە سەرپەرست هەیە.

مووسا بەرەو ژوانگەی پەروەرندەی کەوتە ڕێ. سۆزی گفتوگۆ لەگەڵ خوا، مووسای بە پەلە گەیاندە توور خوا لێی پرسی: «مووسا! بۆ وا تۆ لە هۆزەکەت بە پەلەتری؟ وتی: پەروەرندەم! [ئەوانیش] بە شوێنی منەوەن.

---

(١) ئەعراف: ١٤٢.

بۆیە پەلەم کرد زوو بگەم بە تۆ و لێم رازیی بی».[(١)]

خوا فەرمانی دایە کە ژوانەکەی چل شەوی تەواو درێژە پێ بدا.

مووسا گەیشتە تووری سینا و خوا لەگەڵیا کەوتە وتووێژ. راز و نیازی لەگەلداکرد و وردە وردە لە خۆی نزیك کردەوە. مووسا هەست و سۆز زۆری بۆ هێناو وتی: «پەروەرندەم! خۆت نیشاندە با بت بینم»![(٢)]

خوا ئەیزانی مووسا بەرگەی ئەوە ناگرێ؛ «چوون چاوان خوا نابینن و ئەو چاوان دەبینێ. خوا هەرە وردبین و ئاگادارە».[(٣)]

کێو بە کێویی خۆی بەرگەی وتەی ناگرێ، تابگا بە تیشکیشی. «ئەگەر ئێمە ئەم قورئانەمان بناردایەتە سەر کێوێك، دەتبینی ئەنەوی، و لە ترسی خودا لەت و پەت دەبوو».[(٤)]

لەو رووەوە فەرمووی: من بۆ تۆ نابینرێم، بەڵام بڕوانە بۆ ئەوکێوە؛ ئەگەر ئەو توانی خۆی راگرێ، جا تۆش دەتوانی من بینی.

کاتێ خۆی دەرخست، کێوەکەی بە یەك جار، پریش پریش کرد و مووسا لەسەر خۆی چوو.

کە هۆشی بە خۆدا هاتەوە وتی: پاکی هەر بۆ خۆتە. من پەشیمانم و یەکەمین خاوەن باوەڕم.

فەرمووی ئەی مووسا! من تۆم بە گفتوگۆ و پەیامەکانم لەناو مەردما هەڵبژارد. چت پێ ئەدەم وەری گرە و لە شوکرانەبژێران بە.[(٥)]

---

(١) تاها: ٨٤، ٨٣.
(٢) ئەعراف: ١٤٣.
(٣) ئەنعام: ١٠٣.
(٤) حەشر: ٢١.
(٥) ئەعراف: ١٤٤، ١٤٣.

مووسا ئەو پەڕاوەی[1] کە گەلی ئیسراییل لە هەموو بارێکەوە ئاتاجی پەندە جۆراو جۆرەکانی بوون وەرگرت.

خوا فەرمانی پێدا، بە تەواوی هێزیەوە رایگرێ و بە هۆزەکەشی بڵێ، بە باشی پارێزگاریی لێ بکەن.

وەختێ مووسا گەڕایەوە بۆلای حەوتا پیاوەکەی خزمی و هەواڵی ئەو نیعمەتەی دانێ کە خوا پێی بەخشیبوو، بە زاراوەیەکی ناشیرین و بێشەرمانەوە، وتیان: «ئێمە بڕوات پێ ناکەن، تاکوو روون و ئاشکرا خوا نەبینین».[2]

خوا بە هۆی ئەو بێشەرمییەیان، بەر تووڕەیی خۆی خستن و لە کاتێکا دەیانڕوانی تریشقە لێی دان.

ئینجا بۆیان دەرکەوت، ئەوان لە بەرامبەر ئەو هەورە شریخەوە خۆیان بۆ راناگیرێ. ئیتر چۆن دەتوانن بەرامبەر جلوەی داهێنەری تریشقە، خۆ راگرن!

مووسا لەگەڵ پەروەرێنی قسەی کرد، وتی: «پەروەرندەم! ئەگەر مەیلت لێبایە زووتر دەتکوشتن؛ ئایا دەتهەوێ بە تاوانی ئەو کارەی بڕێك لە نەزانەکانی ئێمە کردوویانە هەموومان لەناو بەری؟!»[3]

خوا نزاکەی مووسای گیرا کرد و پاش مردن زیندووی کردنەوە کە بەڵکوو سپاسکار بن.

---

(۱) پەڕاو: کتێب، دەفتەر.
(۲) بەقەرە: ۵۵.
(۳) ئەعراف: ۱۵۵.

## گوێرەکە

بەرەی ئیسراییل چەن سەد ساڵێك بوو لە میسردا لەگەڵ هاویەش دانەران ژیانیان ئەدایە سەر.

بە چاوی خۆیان قیبتییەکانیان لەو وڵاتەدا دەبینی کە خەریکی پەرستنی شتی جۆراو جۆر بوون.

[وردە وردە] ناحەزیی هاویەش دانانیان لە بیر چوو بووەوە. پاشان، چۆن ئاو، دائەداتە ناو ماڵە کۆنی بن‌فش، هەرواش لەزەتی ئەو ڕێبازە تکا بووە ناو دڵانی ئەوانەوە.

هەر لە دەرفەت دەگەڕان، چۆن ئاو لە لێژاییەوە سەرەو خوار دەبێتەوە، ئاوا بەر بینەوە ناو ئەو بیر و باوەڕەوە. دڵیان لە راستەدا نەمابوو. ئاوەزیان نەخۆشی سەری لێ دابوو. راستەڕێیان کە دەبینی، خۆیان لێ‌دەیوارد و تووشی هەڵە ڕێ ئەهاتن، ملیان پێوە دەنا.

کە لە دەریا پەڕینەوە: «هۆزێکیان بەرچاو کەوت خەریکی پەرستنی بتان بوون. بە مووسایان وت: پەرەستوویەکی وەك پەرەستووەکانی ئەوانەمان بۆ پەیداکە».(١)

مووسا ركی لێ هەستان و پێی وتن: «ئێوە گەلێکی بە راستی دوور لە ئاوەزن!»(٢)

یەکجار سەیرە! پەرتی تا چ رادە! ئاخر خوا چاکەی لەگەڵ کردوون و

---

(١) ئەعراف: ١٣٨. (٢) ئەعراف: ١٣٨.

سەری خستوون! ئەوەی بە ئێوەی بەخشیوە لە دنیادا بە کەسی تری نەداوە!

«[پاشان لێم دەخوازن] جگە لە خوا پەرستوویەکی ترتان بۆ پەیدا کەم! باوەکوو هەر خواش، لە هەموو خەڵکی دنیا پایە بەرزتری کردوون؟!»[١]

مووسا چوو بۆ «توور» و ماوەیەك لێیان دوور کەوتەوە. لەو خولەداکەوتنە ناو داوی شەیتان و تووشی هاریکاردانان بوونەوە.

هەر لە ناو خۆیانا کابرایەکی ناسراو بە سامێریی؛ «پەیکەری گوێرەکەیەکی بۆ دەرخستن، کە بۆڕە بۆڕێکی لێوە دەهات. سامێریی و شاگردانی وتیان: ئائەمە خوای ئێوەیە و خوای مووساشە، [جا مووسا ئەمەی لە بیر چوو]».[٢]

رێز و خۆشەویستی ئەوگوێرەکە، وای لەگەلی ئیسراییل کرد،کەڕ و کوێر ئاسا کەوتنە کڕنووش لێبردنی.

«ئایا ئەوانە نابینن، [ئەوگوێرەکەیە] نە وڵامیان ئەداتەوە، و نە دەشتوانێ زیانێك یان قازانجێکیان پێ بگەیەنێ».[٣]

یا نازانن نە دەتوانێ قسەیان لەگەڵ بکا و نە رێ پیشاندەریشیان بێ؟[٤]

هاروون تێکۆشا لەو کارەیان وەرگێڕێ. پێی وتن: خزمینە! ئێوە بەم گوێرەکە هەڵخەڵەتاون. خوای ئێوە، رۆزیدەری ئێوەیە. وەرن بە گوێم کەن و ئەوەی دەیڵێم بیهێننە جێ.[٥]

بەڵام گەلی ئیسراییل، گیرۆدەی فێڵ و جادووی سامێریی ببوون و

---

(١) ئەعراف: ١٤٠.
(٢) تاها: ٨٨.
(٣) تاها: ٨٩.
(٤) ئەعراف: ١٤٨.
(٥) تاها: ٩٠.

گوێرەکە، دڵی بردبوون. ئەیانوت: «ئێمە دەست لە کارمان هەڵناگرین، هەتا مووسا نەیێتەوە بۆ ناومان.»(١)

## سزا

کاتێ خوا مووسای ئاگادار کرد، کە سامێریی بەرەی ئیسرایـیلی لە ڕێ لاداوە؛ بە توورەیی و دڵگرانییەوە گەڕایەوە بۆ لایان.

[لەبەر خوا]، هەم لە هۆزەکەی تووڕە بوو، هەم لە هاروونی براشی. وتی: «هاروون! وەختێ دیت ئەوانە لە ڕێ ترازاون تۆ بۆ پێڕەویت لە من نەکرد؟ خۆشت سەرپێچیت لێ کردم؟!»(٢)

هاروون داوای لێبوردنی کرد و تی: «مـن لەوە دەتـرسام تـۆ بـڵێی: دوو دەسـتەییت خسـتووەتە نـاو بـەرەی ئـیسرایـیل و فـەرمانی مـنت بـەجێ نەهێناوە!(٣) هۆزەکەم دەسەڵاتیان لە دەست سەندم و ئەوەندەی نەما بوو بشم کوژن!»(٤)

ئەمجا مووسا وتی: پەروەرندەم! لە من و هاروون ببوورە و بەزەییت پێمانا بێتەوە. تۆ لە هەموو دڵسۆزان دڵسۆزتری.(٥)

پاشان ڕووی لە سامێریی کرد و لێی پرسی: «تۆ مەبەستت لەم کـارە چ بوو؟»(٦)

سامێریی دیانی بە تاوانی خۆدا ناو وتی: «نەفسم ئەوکارەی لە بەر چاو

---

(١) تاها: ٩١.
(٢) تاها: ٩٣، ٩٢.
(٣) تاها: ٩٤.
(٤) ئەعراف: ١٥٠.
(٥) ئەعراف: ١٥١.
(٦) تاها: ٩٥.

شیرین کردم.

مووسا پێی‌وت: دەبڕۆ [بیکێشە]، دەبێ تا ماوی هەر بڵێی: لێم نزیك مەبنەوە!»(١)

مووسا لە ناو مەردمی وەدەرنا. ئیتر بە تەنیا دەگەڕاو تاقی تەنیا دەژیا. چەشنی گیانلەبەری کێوی، نەتوخنی کەس دەکەوت و نە کەسیش توخنی دەکەوت.

کام جەزرەبە لە مە بە ژانترە؟!

بەڵێ، ئەوەی هەزاران کەسی تووشی ڕێبازگەی پیسی هاوبەش بۆ خوا دانان کردووە، دەبێ خەڵکی قیزی لێبکەن و دووریی لێبگرن.

هەر کەس جیایی بخاتە بەین خوا و بەندەکانی، دەبێ جیایی بخرێتە نێوان ئەوو بەندەکانی خواوە.

ئەوەی لە سەرزەمینی خوادا مەردم بۆ هاوبەش‌دانان بانگ دەکا، تاوانبارە. دەخوازێ هەموو سەرزەمنی خوای لێ بکرێتە بەندیخانە. دوایی مووسا هاتە وە بەلای گوێرەکە لەحنەتییەکەوە. فەرمانی دا سووتاندیان و هاویشتیانە ناو دەریاوە.

[لەم ئاڵو گۆڕەدا] بەرەی ئیسراییل سەرەنجامی گوێرەکەکەو هیچ و پووچییان بە باشی بۆ دەرکەوت.

لێرەدا مووسا رووی دەمی لە هۆزی ئیسراییل کرد و پێی وتن: «خزمانی من! ئێوە بە پەرستنی گوێرەکە، زلمتان لە خۆتان کرد و بێنەوە بۆلای بە

---

(١) تاها: ٩٧، ٩٦.

دیهێنەرتان و [تاوانکارانی خۆتان] لە ناو بەرن بە لای بەدیهێنەرتانەوە، ئەم کارەتان بۆ چاترە».(١)

ئەوسا هەر واشیان کرد. [واتا:] ئەوانەی بەندەیی گوێرەکەیان نەکردبوو، گوێرەکە پەرستانیان کوشت و خواش پەشیمانی لێ قەبووڵ کردن.

خوا پێ ڕاگەیاندن: «ئەوانەی بوونە گوێرەکە پەرست، وە بەر تووڕەیی خوا دەکەون و هەر لەم دنیایەدا زەبوون دەبن. ئەوەی درۆ هەڵبەستە، وای پاداش دەدەینەوە».(٢)

بەڵێ، سەرەنجامی گوێرەکە پەرستان و هاریکار بۆ خوا دانەران، تا ڕۆژی پەسڵان، ئاوایە!

## ترسەزاڵی گەلی ئیسراییل

بەرەی ئیسراییل لە میسردا بە ئەخلاقی کۆیلایەتی و زەبوونی و ژێرچەپۆکییەوە داهاتبوون. منداڵانیان لەو کەش و هەوایەدا گەروە ببوون. لاوانیان هەر بەو فەرهەنگەوە پێیان نابووە پیریی و لە گوڕ کەوتبوون.

بەو بۆنەوە بیری سەربەستییان هەر لە دڵدا نەمابوو. باسی خەبات و تێکوشانیان هەرگیز بە خەیاڵا نەدەهات.

ژیانیان لە غەریبیا ئەدایە سەر. نە نشتمانێکیان بۆ خۆیان هەبوو، نە دەسەڵاتێکی سیاسیش.

خوا فەرمانی بە مووسا دابوو، بیانباتە سەرزەمینی پیرۆز کە لە وێدا ئازاد

---

(١) بەقەرە: ٥۴.　　(٢) ئەعراف: ١٥٢.

و سەربەخۆ بژین.

مووسا بەرەی ئیسراییلی دەناسی کە چەندە خوێڕیی و ترسەزاڵن.

[هەر بۆیە] دەستی دایە تێکۆشان، کە زاتیان بنێتە بەر و ترسی ئەو ڕێگەیان لە دڵ دەرکا.

چوون گەلێکی ستەمکار بە سەر مەڵبەندی پیرۆزدا زاڵ بوون، کە وێڕای بەهێز بوونیان لە شەڕیشدا گەلێك بەهێز و لێهاتوو بوون. دیارە هۆزی ئیسراییل نەدەچوونە ئەو سەرزەمینە، تاکوو ستەمکاران چۆڵیان نەکردایە.

مووسا وەبیری هێنانەوە کە خوا چەندی چاکە لەگەڵ کردوون و چۆن بەسەر هەمواندا سەری خستوون. بەڵکوو بۆ خەبات لە ڕێی خوادا ئامادە بین و پەی بە بێ نرخی ئەم ژیانە پەستە بەرن.

«مووسا بە هۆزی خۆی وت: هۆزی من! ئەو چاکانەی خوا لە گەڵی کردوون، لە بیر مەبەنەوە. لە ناو خۆتانا پێغەمبەرانی بۆ بەڕێ کردن و چەند پاشاشی لێ پەیدا کردوون. ئەوەی بە ئێوەی بەخشی، بە هیچ کەسی تری نەداوە.»(١)

دوایی پێی وتن: ئەوا سەرزەمینی پیرۆز لە بەر دەستاندایە. تەنیا ڕێگەشتان خەباتە و سەندنەوەیەتی لە دەستی دژمنان. وەختێ یەزدان شتێکی لە چارەنووسی کەسێکا گونجاند کە پێی بگا، ڕێی بێ گەیشتنی بۆ ئاسان دەکا و خواستی یەزدان هەر دێتەجێ.

«گەلی من! بچینە ناو ئەو مەڵبەندە پیرۆزەوە کە خوا بۆی نووسیون».(٢)

---

(١) مائیدە: ٢٠.　(٢) مائیدە: ٢١.

مووسا نگەرانی ئەوە بوو کە خەسڵەتی ترسنۆکی یەکەیان بە سەرا زاڵ بێتەوە. لەو رووەوە پێی راگەیاندن: «بەرەو پاش مەگەڕێنەوە، دەنا دەچنە ریزی زیان لێکەوتوانەوە».(١)

[لەئەنجاما] ئەوەی مووسا لێ دەترسا هاتە دی. لە جوابی هەموو رێنموونییەکانیا وتیان: «گەلێکی ستەمکار لەو وڵاتە دان؛ تا ئەوان جێی نەهێڵن، ئێمە ناچینە ناویەوە!»(٢)

بە ئارامی و لە سەرخۆییەوە ئەیانوت: وەختێ ئەوان چوونەدەرێ، ئێمەش دەچینە جێیان.

«دووکەس لەو باوەڕدارانەی خوا نیعمەتی پێ بەخشی بوون، وتیان: ئێوە لە دەروازەوە پەلاماریان بدەن؛ هەرکە چوونە ژوورێ بەسەریانا سەرکەوتوون. ئەگەر خاوەن بڕوان خۆتان بەخوا بسپێرن».(٣)

بەڵام، هیچکام لەو قسانەش کاری تیا نەکردن و وڵامیان دایەوە: ئەگەر هەر دەبێ بچینە مەڵبەندی پیرۆز؛ تۆ بەیارمەتی موعجیزەکانت رێ بگرەبەر. هەرکە بیستمان گەیشتوویە ئەوێ، ئێمەش دێین و بێ ترس و بێ وەی دەگەینە لات.

وتیان: «مووسا! تاوەختێ ئەوان لەوێدان، ئێمە ناوێرین بڕۆین تۆ و پەروەرندەت بچن و شەڕیان لەگەڵ بکەن. ئێمە لێرە دانیشتووین و بە تەماتانین».(٤)

---

(١) مائیدە: ٢٢.
(٢) مائیدە: ٢٢.
(٣) مائیدە: ٢٣، ٢٢.
(٤) مائیدە: ٢٦، ٢٥.

مووسا بە تووڕەیی و هیوا بڕاوییەوە وتی: «پەروەرێنم! [خۆت دەزانی] من جگە لە خۆم و براکەم دەسەڵاتی کەسم نییە. کەوایە، من و ئەم هۆزە لاسارەم لێك جیابکەوە.

خوا لە جوابی مووسادا فەرمووی: ئەوا ماوەی چل ساڵ بەشیان لەم وڵاتە بڕا و دەبێ لە زەمیندا وەیلان و سەرگەردان بن. بۆ ئەم هۆزە نافەرمان و لە ڕێ دەرچووە خەم مەخۆ».(١)

هەر لەو ساڵانەدا ئەو تۆرەمەیە کە لە میسرا بە فەرهەنگی کۆیلایەتی و ژێرچەپۆکییەوە بارهاتبوون، تێدا چوون. ئەمجا لەو بیاوانەدا بەرەیەکی تر بە ژیانێکی پڕ لە سزا و دژوارییەوە ڕاهاتن و بوون بە گەلی داهاتوو. چارەنووسی یەهوود لە هەر سەردەمێکا ئاوایە. ئەو گەلەی کە بە وەیلانی و خواریی و کۆیلایەتی دەژیا.

## لە ڕێی زانیندا

لە پێغەمبەرە «درووودی خوای لەسەربێ» ئەگێڕنەوە کە، جارێکیان مووسا لە ناو گەلی ئیسرایلدا خەریکی وتاردان بوو. [لەم کاتەدا] لێیان پرسی: زاناترین مرۆ کێیە؟

جوابی دایەوە: ئەمن لە هەموو کەس زاناترم! چوون نەیوت خوا چاتر دەزانێ، پەروەرندەی بەگژیدا چوو! پێی ڕاگەیاند: یەکێ لە بەندەکانی من لە جەمسەری(٢) دوو دەریا [مجمع البحرین] دایە، کە لە تو زاناترە.

---

(١) مائیدە: ٢۶، ٢٥.

(٢) جەمسەر: جێی پێکەوەلکانی دوو شت.

پرسی: پەروەرندەم! جا چۆنی بدۆزمەوە؟

تێگەیەنرا: ماسییەك بخە زەمیلێك و ببیە لەگەڵ خۆت، لە هەر كوێ ماسییەكەت لێ گووم بوو ئەو لەوێدایە.

مووسا هاوڕێ لەگەڵ «یووشەعی نوون»ی شاگردی، ماسییان هەڵگرت و كەوتنە ڕێ. گەیشتنە بن گاشە بەردێك. لە وێدا چاویان قوورس بوو، و خەویان لێ كەوت.

«ماسییەكە لە زەمبیل دەرپەڕی.(١) بە ئەستەمێك خۆی گەیاندەوە بە دەریا و دەرچوو. [ئەم ڕووداوە] بوو بە هۆی سەرسوڕمانی مووساو یووشەعی هاوڕێی».

پاشماوەی ئەو ڕۆژە و شەوەكەشی هەر ڕۆیشتن. كاتێ ڕۆژەوە بوو مووسا بە شاگردی وت: «وەختی نان خواردنە؛ ئا ناشتاكە بێنە. لەم سەفەرەماندا زۆر ماندوو بووین».(٢)

مووسا كاتێ هەستی بە شەكەتی كرد، گەیشتبوونە ئەولای ئەو جێگەی بۆی دیاریی كرابوو.

یووشەع وتی: «ئەزانی وەختی لای بەردەكەدا دانیشتین، من ماسییەكەم لە بیر چووا»(٣)

مووسا وتی: «ئەها! دەجا ئێمەش هەر ئەوەمان دەویست!

دیسان چاوە چاو بە شوێنی خۆیانا گەڕانەوە».(٤)

---

(١) كەهف: ٦٣.

(٢) كەهف: ٦٣.

(٣) كەهف: ٦٣.

(٤) كەهف: ٦٤.

کاتێ گەیشتنەوە لای بەردەکە، پیاوێکیان بەرچاو کەوت کە جل و بەرگێکی باڵا پۆشی لە بەردا بوو.

مووسا سەلامی لێکرد.

پیاوەکە [خضر] پرسی: بۆچی سەلام کردن لە وڵاتی ئێوەدا باوی هەیە؟

جوابی دایەوە: ئەمن مووسام!

پرسی: مووسای بەرەی ئیسراییل؟

وتی: بەڵێ!

دوایی پرسی: «دەکرێ پێڕەوییت لێ بکەم تا لەو زانینەی فێر کراوی، تێمگەیەنی؟

وتی: تۆ تاقەتی هاوڕێیەتی منت نییە!»(١)

مووسا! خوا جۆرێ زانینی بە من بەخشیوە، کە بە تۆی نەداوە. جۆرێ زانستیشی بە تۆ فێر کردووە، کە من ئاگام لێی نییە! مووسا وتی: «ئەگەر خوا یارمەتی‌دام لەسەرخۆ دەبم و نافەرمانی ناکەم.»(٢)

پاشان دوو کەسی ڕۆیشتن و گەینە قەراخی دەریا. خۆیان بەلەم [قایەق]یان پێ نەبوو. کەشتییەك بەلایانا تێپەڕی. لە کەشتی وانانیان خواست سواریان کەن.

ئەوان خزریان ناسی و هەردووکیان بێ کرێ، سوار کردن.

دوایی چۆلەکەیەك هات؛ لەسەر لێواری کەشتی نشتەوە و یەك دوو دەنووکیدا بەئاوی دەریاکەدا.

---

(١) کەهف: ٦٧، ٦٦.	(٢) کەهف: ٦٩.

ئەمجا خزر وتی: سەرنج بدە مووسا! من و تۆ هەر ئەوەندەمان لە زانینی خوا دەستگیر بووە، کە ئەو چۆلەکەیە لە ئاوی دەریای دەستگیر بوو. بە شوێنیا، خزر نەوی لە تەختەیەکی پاپۆڕەکە و هەڵیکەند.

مووسا وتی: [حەی حەی!] ئەوان ئێمەیان بێ پاداش و کرێ سوار کردووە تۆ لە ناو پاپۆڕەکەیانا دانشتووی و کونیشی دەکەی، با چی تیایە بیخاتە ژێر ئاو؟

خزر وتی: ئا! ئەی نەموت تۆ لەگەڵ من هەڵناکەی؟![1]

مووسا وتی: ئەم لە بیر چوونەم لێ مەگرە؛ بۆ ئەمە سەختگیر مەبە.[2]

ئەوە یەکەمین لە بیرکردنی مووسا بوو.

دیسان هەردوو ڕێگەیان گرتەوە بەر. تووشی مێر منداڵێك هاتن، لەگەڵ ئاوالانی سەرقاڵی گەمەوکایە بوو. خزر سەری مێرمنداڵی گرت و بە دەستان لە لەشی جیاکردەوە.

مووسا وتی: [ئاخ!] مرۆیەکی بێ تاوانت، بێ ئەوەی کەسی کوشتبێ لەناو برد؟

خزر وتی: تۆ هاوڕێیەتی منت پێ ناکرێ؟![3]

دیسان پێکەوە ڕۆیشتن. چوونە ناو شارێك و داوای هەندێ خواردەمەنییان لە دانیشتوان کرد، [بەڵام] جێیان نەکردنەوە و هیچیشیان نەدانێ. هەر لەوێدا دیوارێکیان چاوکرد، کە نزیك بوو دابرۆخێ. خزر قۆڵی لێ هەڵماڵی و دروستی کردەوە.

---

(١) کەهف: ٧٢. (٢) کەهف: ٧٣.

(٣) کەهف: ٧٥، ٧٤.

مووسا وتی: واچاتر بوو لە پێناو ئەو کارەیدا شتێکیان لێ بستێنی!

خزر وڵامی دایەوە: ئا ئەمەیان ئیتر جیاکەرەوەی من و تۆیە، لە یەکترا![1]

پێغەمبەر «درودی خوای لەسەربێ» فەرموویەتی: خوا لە مووسا رازیی بێ؛ بریا پەلەی نەکردایە، با ئێمە سەفەرنامەی هەردوولامان بێ کەم و کوورِی بگەیشتایە دەست!

## لێکدانەوە

پاش ئەوە خزر مووسای تێگەیاند. وتی: کەشتییەکە هی دەستەیەکی هەژار و بێدەست بوو؛ کە لە دەریادا کاریان دەکرد. ئەو گۆشەیەم بۆیە شکاند، پاشایەك لەولایانەوە بوو، دەیویست چی کەشتی [ساغ] هەیە بە زۆر تاپۆیانکا.

کوڕەکەش دایك و باپێکی خاوەن باوەڕی هەبوو، لەوانە بوو کە لە رێیان بترازێنێ و لە بەندایەتی خوایان بکا. مەبەستمان ئەوە بوو، خوا لەو چاتر و دڵسۆزتریان پێ ببەخشێ.

خاوەنی دیوارەکەش دوو کوڕی چکۆلەی بێ باوك بوون. گەنجێکیشی لە ژێرا بوو هەر هی ئەوان بوو؛ بابیشیان لە پیاوچاکان بوو. پەروەرێنی تۆ مەیلی لێبوو گەورە بین و خۆیان گەنجەکە دەربێنن. ئەوەش دڵسۆییەك بوو لە لایەن پەروەرندەی تۆوە.

من هیچ کارێکم بێ مەبەست ئەنجام نەداوە. ئەمە بوو رازی ئەو کارانەی

---

(١) کەهف: ٧٨، ٧٧.

تۆ لە بەرامبەریانەوە خۆت بۆ نەدەگیرا![١]

لەوێدا بۆ مووسا دەرکەوت کە، لە توانای ئادەمیزادا نییە پەی بە پەڕ و سنووری زانینی خوا بەرێ. هەندێ لە زانینی خوا لەلای کەسێکە و هەندێکی لەلای یەکێکی تر. «هەرە زانایەك لە سەرەوەی تەواوی زانایاندایە».[٢]

## گەلی ئیسراییل لە دووای مووسا

مووسا کۆچی دوایی کرد. گەلی ئیسراییل تووشی سزا بوون و خوا بە تاوانی کردەوەیان هەڵوەدای سەرزەوی کردن.

«خوا دووچاری زەلیلی و چارە رەشی کردن و وەبەر قاری خۆی خستن».[٣]

ئەوان هۆی نارەزایی خوایان فەراهەم هێنا. خوایە کە پاشا و پێغەمبەرانی لێ خستنەوە. ئەو خوایە کە چاکەیەکی لەگەڵ کردبوون، لە سەردەمی ئەوانا لەم دنیایەدا لەگەڵ کەسی نەکرد بوو.

خوابە کە لە دەستی فیرعەونی رزگار کردن، کە سزای سەختی ئەدان! کوڕانی ئەکوشتن و ژنانی ئەهێشتەوە. دەریای بۆ قڵەشاندن و دەربازی کردن. فیرعەون و دارو دەستەی بە بەرچاوی خۆیانەوە لە ئاودا خنکاندن!

هەوری بۆ کردن بە سایەبان و مەلی شێلاقە و گەزۆی بۆ بەڕێ کردن.

ئەو خوایە کە لە زەویدا کانیاوی بۆ دەرخستن. خواردن و خواردنەوەی

---

(١) جامیعی سەحیحی بوخاری. (٢) یۆسف: ٧٦.

(٣) بەقەرە: ٦١.

فراوانی بۆ دابین کردن.

لە پێناو ئەو هەموو نێعمەتەدا نیشانەکانی پەروەردگاریان بەدرۆ دانا، یاخی بوون و لە رێ لایاندا.

بوون بە هۆی تەنگە تاو بوونی مووسای پێغەمبەریان، کە دڵۆڤانترین بەندەی خوا بوو لە ئاستی ئەواندا و لە داك و بابیان بۆیان دڵسۆزتر بوو.

پێغەمبەرێك، کە دلۆڤانی سەبارەت بەوگەلە، لە رادەی دلۆڤانیی داکێکا بوو، بۆ منداڵی شیرە خۆرە و تەنانەت منداڵی هەتیوی. ئەوکەسەی کاتێ جنێویان دەدایە لە خوا داوای بەخشینی بۆ دەکردن. وەختێ پێی پێدەکەنین بۆیان دەگریا وکە دووریان لێ دەگرت، بەزەیی پێیانا ئەهاتەوە.

ئەو مووسایە کە لە داوی فیرعەونی دەرهێنان. لە زیندانی میسرەوە بۆ سەرزەمینی ئازادیی و ئاوڕوومەندیی هاوردن. لە ژینی کۆیلەو چارەرەشانەوە، بە ژینی بەڕێز و سەربەستانی گەیاندن.

ئەوکەسەی پایەکی یەکجار بەرزی لە لای خوا هەبوو، ئەوان تووڕەیان دەکرد. ئازاریان دەدا. بە گوێیان نەدەکرد. لێی دەهاتنە گەمەو لە ریزی خوارترین پیاوی کۆمەڵدا دایان دەنا.

[جا کەوابوو] ئایا ئەو سزاو خواریی و بێ بایەخی و سەرگەردانی هەمیشەییە پڕ بە پێستیان نییە، کە هەرگیز لێی رزگار نەبن؟ چۆن وانەبێ، ئەوان بە تاوانی کار وکردەوەیان شایانی گشت ئەوانە و زیاتر لەوەشن.

«خوا زڵمی لێ نەکردوون؛ بەڵام خۆیان زڵم لە خۆ دەکەن».(١)

---

(١) ئالی عیمران: ١١٧.

# بەسەرهاتی شوعەیب

## گەشتێك بە سەر ڕووداوەكانی پێشوودا

ئـێوە بـەسەرهاتی ئـیبراهـیم و یـۆسـف و نـوح و هـوود و سـاڵحـی پێشەوامانتان خوێنـدەوە سـەرگوزەشتەی مـووساتان بـە درێژا و بـە وردی خرایە بەرچـاوان. گشت ئـەوانـەتان بـە مـەیل و دڵگـەرمی و چـاوی ڕێز و پەسنەوە دایە بەر سەرنج. ئەو بەسەرهاتە بە نـرخ و دڵگـەشێنـانە لە دڵتـانا جێ گیر بوون و زمانیان رام كردن. [لە داهاتوا] مەردمیش دەتان بینن كە زۆر جاران بۆ خوشك و برای چكۆلە و دای و باب و خۆشك و برای گەورەی خۆتانی دەگێڕنـەوە. لەو كـاتەدا هـەست و سۆز ئـەتانگرێ و ئـازایـەتییان رادەپەڕێ.

## زۆرەوانی نێوان راستی و ناراستی

ئەم كۆمـەڵە بـەسەرهاتە هـاندەر و راپـەڕێنـە؛ بـابەتێكـی نـائاشنا نـییە. گێڕانەوەی زۆرەوانی نێوان راست و درۆیە. بەربەرەكانێ زانست و نەزانی،

ڕۆشنایی و تاریکی، مرۆڤایەتی و دڕەندایەتی، دڵەڕاوکێ و دڵنیایی، گومان و دڵتەختییە؛ پێکەوە.

پاشان باسی سەرکەوتنی ڕاستییە بە سەر ناڕاستییا. زانینە بەسەر نەزانی و کزە بە سەر ملهوڕ و کەمە بە سەر زۆردا.

ڕووداوێکە، زانین و لێزانی و پەند و ڕامانی[١] لێ هەڵدەقوڵێ. بەڕاستی خوای میری مەزن ڕاستی فەرموو کە: «بەسەرهاتی پێغەمبەران ئامۆژگارییە بۆ ئەوانەی وردبین و ئاوەزمەندن. قورئان وتەیەکی هەڵبەستراو نییە، بەڵکوو پاڵپشتی ئەو کتێبانەیە بەر لە خۆی هاتوون. شیکەرەوەی هەموو شتە. ڕێ پیشاندەر و هۆی ڕەحمەتە بۆ گەلی خاوەن باوەڕ».[٢]

## شوعەیبی برایمان بەرەو مەدیەن بەڕێ کرد

ئەوەی لە بەسەرهاتی پێغەمبەران بەرچاومان خستن، تەواوی ئەو سەرگوزەشتانە نین کە خوا لە قورئاندا بۆتان دەگێڕێتەوە. واتا: هەر لە قورئانا جگە لە وانە ڕووداوی تریش هەن. بە نموونە هەڵسوکەوتی شوعەیبی پێغەمبەر، کە خوا بۆ مەدیەن و بۆ ناو دانیشتوانی «ئەیکە»ی بە ڕێ کرد.

گەلی ناوبراو کۆمەڵێکی بازرگان و نشتەجێی دەورو بەری شەقامە ڕێی نێوان یەمەن و شام و عێراق و میسر و لێواری دەریای سوور بوون.

ئەوانیش وەکوو گەل و هۆزی تەواوی پێغەمبەران لە هەر ڕۆژگارێکا، لە وانەبوون هاریکاریان بۆ خوا دادەنا. وێڕای ئەوەش بە ئاسانی لە پێوانە و

(١) ڕامان: بیرکردنەوە، لێکدانەوە. (٢) یۆسف: ١١١.

کێشانەیان دەدزییەوە و کۆمەڵێکی قاچ و قووچکار[1] بوون.

دڵڕەقانە پەلاماری قافڵەیان ئەدا و ئەیانخستە مەترسییەوە. بە گشتی، چەشنی سەرمایەدارانی ملهوڕ، کە نە ئومێدی پادشایان لە دڵدایە و نە ترسی تۆڵە، کاریان ببووە پەرەدان بە بەدفەڕیی و گەندەکاریی. خوا شوعەیبی پێغەمبەری هەنارد بۆ ناویان، کە وێڕای ڕێنموونی هەڕەشەشیان لێ بکا.

شوعەیب: پێی وتن: خزمینە! وەرن بەندایەتی خوا بکەن، کە جگە لەو کەس بۆ پەرستن ناشێ. لە کێشانەو پێوانەداگەڕ مەکەن. زۆر خۆش گوزەران دێنە بەرچاو؛ لە ڕۆژێك دەترسم ئازارێکی داگرتان پێ بگا.

گەلی من! با کێشانەو پێوانەتان بەرانبەر بێ. لە هەقی کەس مەدزنەوە. لە دنیادا لەسەر بەدفەڕیی پێ دامەگرن.[2]

## بانگەشەی شوعەیب

شوعەیب بە درێژا قسەی بۆ کردن و دەستی دایە کردنەوەی گرێیەکانی ـگرێی دارایی دۆستی و زیادە خوازیی ـ دڵیان.

پێی وتن: ئەو ئارامشەی دوای کێشان و پێوانی پڕ بە پڕ رووتان تێ دەکا،

---

(١) قاچ و قووچکار (مُطَفِّف): ئەو کەسەیە، بە شێوازی نهێنی و نامەردانە هەقی خەڵکی و ماڵی ئەم و ئەو بە لای خۆدا دەکێشێ و لەو ڕێگەوە بەهرە لە مەردم وەردەگرێ و بەهرەیەکیان پێ ناگەیەنێ. ئەمجا چوون ئەم چەشنە دزییانە بە ئەستەم و پەنامەکی و بە دوور لە هەر جۆرە دادگایی و سزا دانێکی قانوونی ئەنجام دەبێ، زەرەر و زیانی کۆمەڵگا تووشی مەترسی جۆراو جۆر دەکا.
تەفسیری (پرتوی از قرآن)، بەشی یەکەم جزمی سییەم: ٢٣٣. (وەرگێڕ)

(٢) هوود: ٨٥، ٨٤.

گەلێك هێژاترە لەو ماڵەی بە گەڕبازی و ناهەقی لە مەردمی ئەستێنن. ئەگەر بە وردیی لە ژیانی خۆتان و ئەوانەی بە فێڵ ماڵ کۆدەکەنەوە بڕوانن، تێدەگەن، ئەو ماڵەی بەرهەمی فێڵ وگەڕ و قاچ و قووچە، سەرەنجام بە ڕێی پووچی و بەڵاو بەدفەڕییدا دەڕوا. واتا: یان دەدزرێ‌یان بە تاڵان دەچێ، یا لە ڕێی ناڕەزایی خوادا بەخت دەبێ. یاکوو دەبێتە هی کەسێکی واکە هەر بە فیڕۆی دەبا. کەوایە، کەمی بە کەڵك، چاترە لە زۆری بێ کەڵك.

خوا ئەفەرموێ: «پیس و خاوێن وەکوو یەك نین؛ ئەگەرچی زۆریی پیسەکەش تووشی سەرسامییت بکا».(١)

ئامۆژگاریی من بۆ ئێوە خۆشپێك و دڵسۆزانەیە. ئەو خوایە کە خۆی چاودێری کار و بارتانە، بەنەرمی و لێزانیی و ئاگایی و بیناییەوە دەڵێ: «ئەگەر بڕواتان بە خوا هەبێ، هەرچی ئەو بۆتانی بێڵێتەوە بۆتان چاکە و چاودێریشتان بە من نییە».(٢)

## باوکی دلۆڤان و مامۆستای لێزان

شوعەیب وێنەی باوکێکی دلۆڤان و مامۆستایەکی لێزان، ـبە گوێرەی نیازـ لە هەموو بارێکەوە ئاگاداریی پێ ئەدان و بە شێوازی جۆراو جۆر ڕێنموونی دەکردن.

پێی وتن: «گەلی من! تەنیا خوا بپەرستن جگە لەو پەرستراوێکی‌ترتان نییە. نیشانەیەکی ئاشکراشتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە. با پێوان

(١) مائیدە: ١٠٠.
(٢) هوود: ٨٦.

و کێشانتان تەواو بێ. ماڵی مەردم بەلای خۆدا مەکێشن و مەبنە هۆی ـدوای ئاوەدان کردنەوەی ـ وێرانی وڵاتیش، ئەگەرباوەڕتان بە خوا هەیە، سەربەرزیی و سەرکەوتنان لەمە دایە.

دەست لە رێگریی هەڵگرن و ترس مەخەنە دڵی ئەوانەوە کە بڕوایان بە خوا هێناوە. بۆ ئەوە لە رێگەی خوا لایاندەن و رێگای خوایان بە لارو چەوت پێ بناسێنن. بێتەوە بیرتان، ئێوە کەم بوون و خوا زۆری کردن. سەرنجی گەندەکارانیش بدەن، کە ئەنجامیان بە کوێ گەیشت».(١)

## ولامی هۆزەکەی

وریا و زیرەکی ناو هۆزەکەی کەوتنە بیر کردنەوە لەو بانگەشە و رێنمونیانە وەکوو پەیان بە رازێك بردبێ یان مەتەڵێکیان هەڵێنابێ، بە فیز و دەمارڕێکەوە پێیانوت: «شوعەیب! ئەمە نوێژەکەت پێت دەڵێ کە ئێمە دەبێ دەست لەو شتانە هەڵگرین وا باب و کاڵمان دەیانپەرستن، یان ماڵ و داراییمان بە دڵخوازی خۆمان بارەو بار نەکەین؟ خۆ تۆ پیاوێکی لەسەر خۆ و ئاوەزمەندای!»(٢)

## شوعەیب بانگێشتەکەی شی دەکاتەوە

شوعەیب [دیسان] هەر بە نەرم و نیانی رەفتاری لەگەڵ کردن. سەختگیری نەکرد و لێیان تووڕە نەبوو. تێی‌گەیاندن، ئەوەی ئەوی ـپاش

---

(١) ئەعراف: ٨٦، ٨٥.

(٢) هوود: ٨٧.

بێدەنگییەکی درێژخایەن ـ هێناوەتەوە سەر بانگەشەی دڵسۆزانە و ئاکاری ناشیرین و ستەمکارانەی ئەوانی بە توندنی جواب نەداوەتەوە: چی‌تر نەبووە، یاریەکی خوایی نەبێ. ئەو یارییەشی لەم دواییەدا وەکوو پێغەمبەرێك پێی کراوە و خوا بە تیشکی خۆی دڵی بەهێز کردووە.

ئەمجا هەرگیزیش بە خێڵی بە دارایی ئەوان، ئەوی بەو ڕێگەدا هەڵنەناوە. چوون خوا بە ڕۆزی پاك و گەوارای خۆی تێر و تەسەلی کردووە. بەو بۆنەوە ئەویش خۆی بە بەختەوەر دەزانێ. دڵی ئارام و خەیاڵی ئاسوودەیە؛ بە دڵ و بە زمان سپاسکاری خوای خاوەن شکۆیە.

شوعەیب هەرگیز بە مەردمی نەئەوت فلان کار مەکەن؛ بەڵام خۆی ئەنجامی بدا. لە ڕێگەیەك نەیدەگێڕانەوە، دوایی خۆی پیادا بڕوا. خەڵکی لەسەر چاکە و پیاوەتی هەڵنەدەنا و خۆی لێ بدزێتەوە. ئامۆژگاری بێ کردەوە نەبوو. بە دڵ خوازیاری ڕێك و پێکی و خۆشبەختی و ڕزگارییان بوو، لەو ئازارەی گەمارۆی دابوون [تێی گەیاندن] کە هەر کردەوەیەکی چاك و هەر بەخششێک لە لای خوا دەپارێزرێ و هەموان هەردەبێ خۆ بەو بسپێرن.

لێی پرسین: «خزمانی من! ئەگەر بڵێم، بەڵگەیەکی باوەڕ پێدەری پەروەرندەم لەلایەو هەر خۆشیە بژیوی چاکی پێ داوم دەڵێن چی؟ کە بەرامبەرتان ئەوەستم و دەڵێم ئەو کارە مەکەن، ڕقم لێتان نییە. تەنیا نیازم ساماندانی کار وبارتانە، لەرادەی توانام‌ا. سەرکەوتنیشم هەر بە خوایە. ژینی خۆم بەو سپاردووە و بۆلای خۆی دەگەڕێمەوە».(١)

---

(١) هوود: ٨٨.

## لە وتەکانت شتێکی وا تێناگەین

ئەگەرچی شوعەیب خۆی لە دایك بووی وڵاتەکەو برای ئەو خەڵکە بوو، بەڵام ئەوان وا خۆیان لە مەبەستەکانی گێل دەکرد، وەکوو ئەوە بە زمانێکی بێگانە لە گەڵیان بدوێ. هەرچەن ئەو لە ڕیزەی ڕەوانبێژترین و ڕۆشنبیرترینیانا بوو، وایان دەنواند کە بە زاراوەیەکی گرێدار و ناڕەوان قسان دەکا. دیارە هەر کۆمەڵێك قسەو باسێکیان لەلا ناحەز بوو، هەڵسوو کەوتیشیان [لە بەرامبەریەوە] هەروا دەبێ.

## شوعەیب سەری لە ڕەفتاری گەلەکەی سوڕ دەمێنێ

تەنیایی و بێ دەسەڵاتی شوعەیب ببووە هۆی بەرهەڵست وەستانی هۆزەکەی. ئەگەر لەبەرکەس وکاری بیان وێرایە بەردبارانیان ئەکرد و خۆیان لە دەست رزگار دەکرد. شوعەیب ئەو بیرو بۆ چوونەی ئەوانی یەکجار پێ ناخۆش بوو. سەر سام بوو لەوەی بۆ دەبێ خوای بەهێز و توانای تاقە دەسەڵاتداریان لە کەس و کارێ کە [وەکوو هەموو ئادەمیزادێك] داماوی دەستی کزیی و لاوازیی و نەخۆشی و مردنن لەلاکەم بایەختر بێ.

پێیان وت: شوعەیب: ئێمە لەوانەی تۆ دەڵێی زۆرکەم تێدەگەین. لە ناو خۆشماناکەم دەسەڵاتت دەبینین و ئەگەر لە بەر کەس و کارت نەبایە بەریارانمان دەکردی. تۆ دەرەقەتی ئێمە نایی.

جوابی دانەوە: «گەلی من! ئایا ئێوە خزمانی منتان لە خوا پێ گرنگترە؟ کە خواتان خستووەتە پشت گوێتانەوە؟ پەروەرندەی من بە سەر هەر کارێکا

ئێوە دەیکەن زاڵە».[١]

## دوایین هەڕەشە

وەختێ هیچ بەڵگەیەکیان [بۆ دژایەتی] بە دەستەوە نەما، ئەو دوایین هەڕەشەی کە ملهوڕانی هەرگەلێك لە پێغەمبەری خۆیانی دەکەن، خستە کار.

دەسەڵاتدارە لە ڕێ دەرچووەکانی هۆزی وتیان: «شوعەیب! ئێمە تۆیش و ئەوکەسانەش لەگەڵ تۆ بڕوایان هێناوە لە شاری خۆمان دەردەکەین؛ یاکوو دێنەوە سەر ئاینی ئێمە».[٢]

## بەڵگەی یەکلاکەرەوە

جوابی شوعەیب شانازیی بوو بە دینەکەیەوە و ئازایی و خۆ ڕاگریی لە پێناو بیر و باوەڕیدا.

وڵامی دانەوە: «ئەگەرچی حەزیش نەکەین؟ ئەگەر بینەوە سەر دینی ئێوە، دوای ئەوەی خوا ڕزگاری کردین دیارە درۆمان بە زمانی خواوە هەڵبەستووە. ڕەوا نییە ئیتر بێینەوە سەر ئەو ئایینە، مەگەر پەروەندەمان مەیلی لەسەر بێ. زانستی خوا هەموو شتی داگرتووە و ئێمەش خۆمان پێ سپاردووە. ئەی پەروەرندەمان! لە نێوان ئێمەو گەلەکەماندا داوەری بکە؛ تۆ خۆت باشترین داوەری».[٣]

---

(١) هوود: ٩٢، ٩١. (٢) ئەعراف: ٨٨.

(٣) ئەعراف: ٨٩، ٨٨.

## وتەکەیان هەر وتەی پێشوان بوو

دوایین هەڕەشەش کارێکی بۆ نەکردن. ئەوسا پەنایان بردەوە بە واتەی پێشوان و وتیان: «گومانی تێدا نییە تۆ جادووت لێکراوە».[(١)] تۆش هەر بنیادەمێکی وەکوو ئێمە و پێمان وایە پیاوێکی درۆزن بی.

«ئەگەر درۆ ناکەی، ئا بەشێ لە ئاسمانمان بە سەرا داخە!»[(٢)]

ئەنجامی هەموو ئەو گەلانەی پێغەمبەرانیان بە درۆزن دانا و لە ئاستی چاکەی خوا سپڵە بوون، وەکوو یەك وابوو.

«پاشان بوومەلەرزەیەکی بەهێز دایگرتن و هەر لە ماڵی خۆدا لەناوچوون. ئەوانەی وتەکانی شوعەیبیان بە درۆ دادەنا، بە جۆرێك تێدا چوون، پێت وابوو، هەر لە وێدا نەبون. ئەوانەی شوعەیبیان بە درۆزن لە قەڵەم دا، زیانیان هەر بە خۆیان گەیاند».[(٣)]

## گەیاندنی پەیامی ئامانەت

ئەرکی شوعەیبیش وەکوو ئەرکی تەواوی پێغەمبەران وابوو، پەیامەکەی ڕاگەیاند؛ ئامانەتی هێنایەجێ و بەڵگە و بڕیاری سەلماند. «ئەوسا ڕووی لە گەلەکەی وەرگێڕا و پێی وتن: خزمینە! ئەمن پەیامەکانی پەروەرندەم بە ئێوە گەیاند و راوێژیشم بۆ کردن. ئیتر خەم بۆ ستەمکاران بۆچی بخۆم».[(٤)]

---

(١) شوعەرا: ١٥٣.

(٢) شوعەرا: ١٨٧، ١٨٥.

(٣) ئەعراف: ٩٢، ٩١.

(٤) ئەعراف: ٩٣.

# بەسەرهاتی داوود و سلێمان

ناوەرۆکی قورئان، تەنیا ناوبردنی رۆژەکانی خوا و باسی بە درۆزن دانانی پێغەمبەران و گاڵتەو سووکایەتی پێکردن و جەزرەبە دانیان لەلایەن ئەو کۆمەڵانەوە کە تیانا سەریان هەڵداوە، نییە.

یان تەنیا بەگێڕانەوەی چۆنیەتی بەڵا بۆگەیین و تێکشکان و لەناو چوونی ئەو گەل و هۆزانەوە کە پەیامی پێغەمبەرانیان بە درۆ داناو، سووکایەتییان پێ کردن و پیلانیان گێڕا و هەوڵی کوشتنیان دان ـ وەك لە بەسەرهاتی پێغەمبەرانا دیتان ـ ناوەستێ.

## قورئان باسی نیعمەتەکانی خوا دەکا

بەڵێ، قورئان قسە لە نێعمەتەکانی خوا دەکا. ئەو نێعمەتە جۆراو جۆرانەی کە ئەگەر بە زۆرایی بەخشیویە، یان کەمی کردۆتەوە ئەخاتە بەر باسەوە. خوا خێر و چاکەی بە زۆرێك لە پێغەمبەرانی بەخشیوە، کە دواوود و سلێمان و ئەیۆب و یۆنس و زەکەریا و یەحیا لە وانەن.

بەتایبەت داوود و سلێمانی لەسەرزەویدا دامەرزاندو فەرمانڕەوایی پان و بەرینی خستە ژێر چنگیانەوە. لە زانینی تایبەت، بەشداری کردن و لە گەلێك لەو شتانەی خەڵکی لێی بێ ئاگا بوون، ئاگاداری کردن. دەسەڵاتدارانی جیهان و گیانلەبەرانی نادەستەمۆ و دیاردە بێ گیانەکانی بۆ ڕام کردن. خۆی ئەفەرموێ: «ئێمە زانستمان بە سلێمان و داوود بەخشی. وتیان سپاس بۆ خوا ئێمەی لە چاو گەلێك لە بەندە خاوەن باوەڕکانی بەڕێزتر گرت. پاش داوود، سلێمان بوویە جێنشینی و ڕایگەیاند: ئێمە فێری زمانی مەلان کراوین و هەموو شتێکمان پێ بەخشراوە. دیارە ئەمەش نێعمەتێکی ئاشکرایە».(١)

## چاکەی خوا لەگەڵ داوود

خوا کێو و مەلانی وەها بۆ داوود ڕام کردبوو، کە لە کاتی گازە(٢) و نیایشدا بۆیان ئەسەندەوە و هاودەنگی بوون. فێری دروست کردنی زەنجیری کرد و ئاسنیشی بۆ نەرم کرد: «بە ڕاستی چاکەیەکی زیاتر مان لەگەڵ داوود کرد: ئەی کێو و مەلان! ئێوەش لەگەڵ ئەر پەسنی پاکی خوا بکەن. [وێڕای ئەوە] باڵاپۆش ئاسنیشمان بۆ نەرم کرد، [پێمان وت:] بەرگی لە ئاسن دروست کە بۆ ئاڵقەش، ئەندازە لە بەرچاو بگرە. کار و بارتان بە چاکی ئەنجام بدەن؛ خۆم چاوێدیری کارتانم».(٣)

«کێوەکان و مەلانمان خستە بەر فەرمان تا لەگەڵ داوود پەسنی خوا بەجێبهێنن؛ توانیمان کاری وا بکەین. فێریشمان کرد، پۆشەنی زرێتان بۆ

(١) نەمل: ١٦، ١٥.    (٢) گازە: مناجات.

(٣) سەبەء: ١١، ١٠.

دروستکا؛ تا لە شەڕدا بتانپارێزێ. ئایا ئێوە شوکری خوا بەجێ دێنن؟»[١]

## سپاسی چاکەی خوا

داوود سەرەڕای فەرمانڕەوایی پان و بەرین و لەشی بەهێز و دەستی هونەرپەروەری، بەندەیەکی خۆبەکەم زانی زۆر روو بە خوا بوو. پەسن و گازندەی درێژخایەن و فەرمانڕەوایەکی زۆر دادپەروەر بوو. کار و باری مەردم و ناوکۆمەڵی بەپێی دادگەریی وراستی خوازیی جێبەجێ دەکرد، نە ئارەزووی نەفس. خوا پێی فەرموو: «ئەی داوود! ئێمە تۆمان لە سەرزەویدا کرد بە جێنشین. با داوەرییت لە ناو مەردما دادپەروەرانە بێت. مەکەوە شوێن ئارەزووی خۆت، کە لە رێی خوا لات بدا.

ئەوکەسانەی لە رێ خوا دەرچوون، رۆژی پەسڵانیان لە بیر بردۆتەوە و ئازارێکی سەخت چاوەڕوانیانە».[٢]

## چاکەی خوا بەرامبەر سلێمان

خوا «با»ی بۆ سلێمان دەستەمۆ کرد، کە بە فەرمانی ئەو هات‌و چووی دەکرد. لە ماوەیەکی کورتا خۆی پێ ئەگەیاند و لە جێیەکەوە ئەگەیشتە جێیەکی‌تر. بەهێزترین و شارەزاترین جندۆکان و دێوگەلی سەرپزیوی بۆ رام کردبوو کە هەر فەرمانێکی پێ ئەدان بۆیان ئەهێنایە جێ. جادەو شەقامیان خۆش ئەکرد و خانوو بەرەی سەر لە ئاسمان ساویان، ساز ئەدا.

---

(١) ئەنبیا: ٨٠، ٧٩.
(٢) ساد: ٢٦.

« با مان بۆ سلێمان رام کرد، کە بە فەرمانی ئەو بڕواتە ئەو سەرزەمینە ئێمە پیتمان تێ خستووە و ئاگاداریشمان لە هەموو شتێك هەبوو. لە شایەتینیش هەندێکیان بۆ ئەو دەچوونە بن ئاو و کاری تریشیان بۆ ئەنجام دەدا و خۆمان ئەمانپاراستن.[١]

« با مان خستە ژێر فەرمانی سلێمان، کە مەودای [ڕێ برینی] بەیانی، یەك مانگ و هی ئێوارەی، یەك مانگ بوو. کانی مسیشمان بۆی تواندەوە و بڕێك لە جندۆکانیش ـ بە فەرمانی پەروەرندەی ـ لەبەر دەستیاکاریان دەکرد. هەر کام لەوانە لە فەرمان دەرچوایە، تووشی سزای ئاگرمان دەکرد. چی دەویست بۆیان ئەنجام دەدا. لە [سازدانی] پەرستگەوە تا پەیکەر و دەفر و کاسەی گەورەی حەوز ئاسا و قازانی دابەستراو. ئەی شوێنکەوتوانی داوود! سپاسی خوا بەجێ بێنن. لە بەندەکانم کەمتریان سپاسکارن».[٢]

## تێگەیینی ورد و زانستی قووڵ

زیرەکی و وردبینی و لێکدانەوەی دروستی سلێمان لەو مەسەلەدا دەرکەوت کە لە باوکی هێژایان پرسی بوو: رانە مەڕی هۆزێک چوو بووە ناو باخە مێوی هۆزێکی تر و ترێی گەیشتووی باخەکەیان لەناو بردبوو، داوودیش مەڕەکانی دابوو بە خاوەنی باخەکە. سلێمان پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا! داوەریی [ئەم کێشەیە] بە جۆرێکی تر دەبێ. پرسی: چۆن؟ وتی: باخەکە بدە دەستی خاوەن مەڕەکان، تا کاتێ وەکوو خۆی لێ دێتەوە.

(١) ئەنبیا: ٨٢، ٨١.　　(٢) سەبەء: ١٣، ١٢.

مەڕەکانیش بسپێرە بە خاوەن باخەکە کەڵکیان لێ وەرگرێ، تا باخەکەی دێتەوە دۆخەکەی جارانی و ئەوسا هەرکام دەسپێرییەوە دەستی خاوەنی.

خوا تێگەیشتنێکی ورد و زانستێکی قووڵی بە سلێمان بەخشیبوو، کە ئەفەرموێ: «داوود و سلێمانیش بێنەوە بیر، وەختێ داوەرییان لەسەر ئەو کێڵگەیە کرد، کە لە کاتی شەوا ئاژەڵی کۆمەڵێك بڵاوەیان پیادا کردبوو و ئێمە چاودێری داوەرییەکەیان بووین. سلێمانمان تێگەیاند دەبێ چ بکا، کارزانی و زانستمان بە هەردوکیان دا».[١]

## سلێمان زمانی باڵندە و گیانلەبەرانی دەزانی

قورئان باسێکی بە کەڵك و سەرنجڕاکێش لە سلێمان دەگێڕێتەوە، کە پیشاندەری مەندیی و دڵفراوانییەتی لە فەرمانڕەوایی و بەڕێوە بردنی کارو باردا. دەردەکەوێ کە خوا چۆن بەختەوەریی هەر دوو جیهان و دنیاو دین و فەرمانڕەوایی و پێغەمبەریی لە کەسایەتی ویدا[٢] [بە باشی] یەك خستبوو. سلێمان کە زمانی باڵندە و گیانلەبەرانی دەزانی، جارێکیان لەشکرەکەی کە لە جندۆکە و مرۆ و باڵندە پێك هاتبوو، کۆ کردەوە. لەشکری رێك و پێك و ساماندراو بەر فەرمانی فەرماندەرانی خۆیان بوون، سلێمانیش بە شێوازێکی بەسام و مەزنانەوە لەگەڵیان سووار بوو. کاتێ گەیشتنە شیو

(١) ئەنبیا: ٧٩، ٧٨.

(٢) وی: ئەو.

[مەڵبەند]ی مێروولان، مێروولەیەك ترسی نشتە دڵ، کە لەوانەیە سلێمان و سپاکەی نەزانن و ئەندامانی هۆزی ئەو لە ژێر پێی ئەسپەکانیانا بتلەقێنەوە. بەو بۆنەوە فەرمانی پێدان بچنەوە ناو شارەکەیان! سلێمان لەوە تێگەیشت، بەڵام چوون راسپاردەی خوا بوو، کەمترین هەستی خۆ بە زلزانـی بـە دڵدا نەهات، بەڵکوو دەستی دایە پەسنی خوا و شوکری ئەو نـێعـمەتانەی پـێی بەخشیبوو. دوایی بۆ سەرکەوتن لە رێی خزمەت بە مەردم و چوونە ریزی بەندە چاکەکانەوە لە خوا پاڕایەوە.

## پەپووسلێمانە

پەپووسلێمانە، دیدەوان و بە رایکێشی سپا بوو. سلێمان پێی سپاردبوو، جێی ئاو و جێی بەزینی لەشکری بۆ بدۆزێتەوە. رۆژێکیان پەپو گـوم بـوو. سلێمان دڵگران بوو، و هەڕەشەی لێکرد. ماوەیەکی کەم دیاری نەبوو؛ پاشان هاتەوە. بە سلێمانی وت: جێگەیەکم دیتوەتەوە، کە نە تۆ خەبەرت لێی هەیە، نە سەربازانیشت. هەواڵێکی باوەڕ پێدەرم لە گەلی «سەبا» و پاشاکـەیان بـۆ هێناویتەوە [گەلی ناوبراو] خاوەن ماڵ و مڵکێکی زۆر و زەبەند و دەوڵەتێکی گـەورەو بـەهێزن. بـەڵام سـەرەڕای ئـاوەز و زیـرەکـی و دەسـەڵات و فەرمانڕەواییان، بە کۆمەڵێکـی گـێل و نـەزانـم هـاتنە بـەر چـاو. خـەریکی پەرستنی هەتاون. پەیان بەو هەڵەیە نەبردووە و رێی بەندایەتی خوای تاك و تەنیایان بۆ نەدۆزراوەتەوە.

## سلێمان بانگێشتی پاشای سەبا دەکا، کە بێتە سەر دینی

بۆ پێغەمبەری خوا ناخۆش بوو، کە نەتەوەیەك لە دراوسێیەتی وڵاتیا بن؛ نەیانناسێ و بانگەشەی ئەویان پێ نەگەیشتبێ و سوژدە لە هەتاوێ بەرن. دڵێریی ئایینی و پێغەمبەریی لە دەروونیدا راپەڕی. وای بەباشتر زانی، بەر لەوە بە سپا لێهاتووەکەیەوە هەڵمەتی وڵاتەکەیان بدا، نامەیەك بۆ پاشا و فەرمانڕەوای هاوبەشدانەریان بنووسێ و داوایان لێبکا بێنە سەر ئایینی ئیسلام و رێی بەندایەتی خوا.

لەو رووەوە نامەیەکی رۆشنکەرەوەی بۆ نووسی و داوای لێکرد باوەڕ بهێنێ و خۆی بە خوا بسپێرێ. نامەکە تێکەڵاوێك بوو لە دڵسۆزیی و توندیی؛ نەرمی پێغەمبەرانە و نەترسی شایانە.

## پاشا پرس و رای بەرپرسانی دەوڵەتی دەکا

سلێمان هەم پێغەمبەر بوو، هەم فەرمانڕەوا. ئەو ژنەش کە بەرێوەبەری کار و باری وڵاتی سەبا بوو، مرۆیەکی ئاوەزمەند بوو؛ بە پەلە داوەریی نەکرد. سەبارەت بە کاری پاشایان و هەڵسو کەوتی داگیرکەران ئەزموون و بەراوردێکی فراوانی هەبوو. بەڵێ ئەوەندە وریا نەبوو کە خوا بناسێ و ئەرکی بەندایەتی بەجێ بێنێ، بەڵام لێرەدا فیزو دەماری پاشایانە دنەی نەدا[1] و لەسەر بیر و رای خۆی پێی دانەگرت. کاربەدەستانی پایە بەرزی

---

(١) دنەدان: هەڵنان، هەڵخڕاندن.

دەوڵەتی لە ناوەرۆکی نامەکە ئاگادارکرد. چوون لەگەڵ نامەکانی‌تر فەرقی هەبوو. لەلایەن گەورترین فەرمانڕەوای سەردەم و پێغەمبەرێکی بانگێشتکاری خوا ناسییەوە هاتبوو.

کەسایەتییە دەوڵەتییەکان وێڕای ئاماژە بەهێزو توانای خۆیان و فراوانی سپاو سانیان ـ وەك لە کۆڕ و دانیشتنی پاشا و دەسەڵاتدارانی هەرکات و هەرجێگەیەکا روو ئەدا ـ بۆ لە خۆ رازیی کردنی دڵی شا، دەسیان دایە ریا بازیی. پاشا وتەکانی پێ چاك نەبوون و بیر و بۆ چوونی پەسەند نەکردن. بەڵکوو لە ئاکامی پڕزیانی کارەسات ترساندنی. چۆنیەتی رەفتاری فەرمانڕەوایانی داگیرکەری بەرامبەر گەلانی تێکشکاو و ئەوسا بارودۆخی دوای تێکشکانی بۆ گێڕانەوە و پێی وتن: ئاکامی گەل و نشتمان ئاوا دەبێ. دوایی رایگەیاند: من خۆم هەندێ دیاری زۆر گرنگ و بە نرخ بۆ سلێمان بەرێ دەکەم و تاقی دەکەمەوە. ئەگەر گلی دایەوە، پاشایە و دەبێ شەڕی لەگەڵ بکرێ، ئەگەر وەریشی نەگرت، دیارە پێغەمبەرە و دەبێ پێڕەویی لێ بکرێ.

## دیارییەکی سەوداگەرانە

پاشان دەستەیەکی بە دیارییەکی یەکجار گرانی شایەنی پاشایانەوە بۆ لای سلێمان بەرێ کرد. بەڵام کاتێ سلێمان دیارییەکەی گەیشتە دەست، وەری نەگرت و ملی بە گلدانەوەیدا نەکرد. لە جوابدا وتی: دەتانەوێ بە پوڵ و پارە فریوم دەن، کە کارم بە سەر هاوبەش دانان و فەرمانڕەواییتانەوە نەبێ؟ ئەو ماڵ و دەسەڵات و لەشکرەی خوا پێی بەخشیوم، لەوەی لەلای ئێوەیە

گەلێك چاتر و گرنگترە. دژایەتی نێوان ئێمەش کێشەیەکی بە راستییە؛ گەمەو گاڵتە هەڵناگرێ. کێشەی بانگەشەو بەندایەتی خوایە، مامەڵەی قازانج و زیان نییە. ئەوسا هەڕەشەی شەڕۆکەوتنە مەترسی دەسەڵاتیشی لێکردن.

## پاشا بە لارە ملێیەوە دێ

شاندە[1] کە گەڕایەوە بۆ لای پاشای سەباو ئەوەی رووی دابوو، بۆیان گێڕایەوە. ئەمجا شا و گەلەکەی ملیان هێنایە راستەو رایان هاتە سەر ئەوە خۆی و سپاو ساتی بەرەولای سلێمان رێکەون. کاتێ سلێمان لە هاتنیان ئاگادار کرا، خۆشحاڵ بوو و سپاسی خوای بەجێ‌هێنا. ویستی نیشانێك بەو ژنە نیشان بدا، کە هەم پیشاندەری توانای خوا بێ و هەم چاکەیەکیش کە پەروەرندەی لەگەڵی کردووە. لێبڕا ئەو تەختی پاشایەتییەی کە چەند پیاوی بەهێز و توانا پارێزگارییان لێ‌دەکرد لە بەردەستا دانێ. داوای لە کارگێڕانی دەور و بەری کرد، بەر لە گەیشتنە بەرەوەی ئەو لەشکرە زۆر و زەبەندە تەختەکەی بهێنن.

ئەوەی سلێمان ویستی، لە ماوەیەکی کورتا هاتەجێ و ئەو کارەش موعجیزەیەك بوو. ئەوسا بە نیازی تاقی کردنەوەی وریایی پاشا، فەرمانی دا رواڵەتی تەختەکەی هەندێ بگۆڕن؛ با بزانێ کە بەر چاوی کەوت دەیناسێتەوە! ئەگەر پەی بەوە نەبرد، دەردەکەوێ مرۆیەکی تیژ بین نییە و بابەتیی لەوە وردتری بۆ لێك نادرێتەوە.

---

(١) شاند: دەستە.

## کۆشکی گەورەی لە ئاوێنە سازدراو

سلێمان فەرمانی‌دا بە ناو ئەندازیارانی مرۆ و جندۆکەدا بە ئاوێنە کۆشکێکی گەورەی وایان بۆ پاشای سەبا دروست کرد، کە ئاوی بەژێردا دەڕۆیشت، [بە شێوازێکی وا] ئەوەی ئاگای لەو جوانکارییە نەبایە، ئاوێنەکەی بە ئاو دەزانی. چوون ئاوێنەکە لە نێوان ئاو و رابگارددا[١] جێ‌گیر ببوو. ئاشکرا بوو کە پاشاش لای وایە ئاوە؛ تووشی هەڵە دەبێ، و قولی بۆ هەڵدەکا. ئەمجا لەوێدا هەڵەو هەڵخڵەتانی خۆی بەرامبەر بە رواڵەتی هەر دیاردەیەك بۆ دەردەکەوێ. ئەویش و هاونشتمانانیشی خەریکی پەرستنی خۆر بوون. بەڵێ، خۆر گەورەترین سەرچاوەی رووناکی و مایەی ژیانە؛ بەڵام خۆی یەکێکە لە دیاردەکانی خوای خاوەن شکۆ. جا لێرەدا رادەچەنێ و تێدەگا، کە وەك چۆن ئاوێنەکەی بە ئاو هاتە بەر چاوان و قولی بۆ هەڵکرد، لە مەڕ هەتاویش بە هەڵەدا چووە، کە بە راهێنەری جیهانی زانیوە. سوژدەی لێ‌بردووە و بەندایەتی کردووە. ئائەو داچڵەکانەش لە سەد وتار و هەزار بەڵگە بۆی بە کەڵکتر دەبێ.

## هاوڕێ لەگەڵ سلێمان خۆم بە بەدیهێنەری جیهان سپارد

پێش‌بینییەکە هاتە دی. شای سەبا، سەرەڕای وریایی و زیرەکی، تووشی هەڵەیەکی گەورە هات. پێی وابوو ئەو ئاوێنە ئاوێکی بریکەدارە، کە لە

(١) رابگارد: رێبوار.

شەپۆل وەشاندن و بوردن دایە. قولی هەڵکرد و خەریك بوو بڕواتە ناویەوە. سڵێمان لەو هەڵەیە ئاگاداری کرد و وتی: ئەوە کۆشکێکی لە ئاوێنە سازدراوە. لێرەدا چاوی دڵی کرایەوەو پەی بەو خەتایەی برد، کە تیشکی چرای بە خودی چرا زانیوە؛ کە هەر ئەوەش تووشی سوژدە بردن لە هەتاوو بەندەیی هەتاوی کردووە ئەوسا ئیتر خۆی بۆ نەگیرا و ریگەیاند: «خوایە! من [تا ئێستا] ستەمم لە خۆم کردووە؛ ئەوا لەگەڵ سڵێمان خۆم سپاردە دەستی راهێنەری هەموو جیهان».[1]

## قورئان سەرگوزەشتەی سڵێمانمان بۆ دەگێڕێتەوە

ئەم رابواردە هێژا و سەرەنجراکێشە لە قورئاندا بخوێنەوە «خوا ئەفەرمێ: [سڵێمان] چاوی بە مەلاندا گێڕاو پرسی: پەپووسڵێمانە بۆ دیار نییە؟ خۆی دزیوەتەوە یا چی؟! لەسەر ئەم کارەی، یا ئازارێکی چاکی دەدەم، یاکوو سەری دەبڕم؛ یان دەبێ بەڵگەیەکی باوەڕ پێدەرم بۆ بێنێ. ئەوەندەی پێ نەچوو [پەپوو] هاتەوە و وتی: من شتێکم دۆزیوەتەوە، تۆ پەیت پێ نەبردووە. من لە [وڵاتی] سەباوە هاتوومەوە؛ هەواڵێکی راست و دروستم بۆ هێناوی. ژنێکم دی کە فەرمانڕەوایان بوو. ئەو ژنە خاوەنی هەموو شتێکە و تەختێکی زۆر گەورەشی هەیە. سەرنجم دا خۆشی و گەلەکەشی ـلە جێی خواـ سوژدە لە هەتاو دەبەن. شەیتان کارو کردەوەی لەبەر چاو شیرین کردوون و وای سەر لێ شێواندوون راستەڕێیان لێ گوم بووە. بەندایەتی ئەو

(١) نەمل: ٤٤.

خوا ناکەن کە شاراوەو نادیاری ئاسمانەکان و زەوی ئاشکرا دەکا و لە هەرچی دەیشارنەوە، یان دەیخەنە روو ئاگادارە. ئەو خوایە کە جگە لەو هیچتر بۆ پەرستن ناشێ و هەر خۆیەتی خاوەنی تەختی [فەرماڕەوایی] هەرەمەزن.

[سلێمان]وتی: بابزانین قسەکەت راستە؛ یان تۆش لە ریزی درۆزناندای.

ئەم نامەیەم ببەو بۆیانی داخە، ئەوسا تۆزێ دووریان لێبگرە، بزانە جواییان چ دەبێ.

[کاتێ نامەکەی بۆ هاویشتن]شا وتی: بەڕێزان! نامەیەکیان بۆ داخستووم زۆر سەرنجراکێشە، لە لایەن سلێمانەوەیە و بەناوی خوای دەهندە و دلۆڤانەوە دەستی پێکراوە [دەبێژێ:] ئێوە نابێ خۆ لە من بە زلتر بزانن، بێن بۆ لام و خۆ بە دەستەوە بدەن! پیاوە هێژاکان! رای ئێوە بەرانبەر بەم کارە چییە؟ بێ پرس و رای ئێوە من ناتوانم هیچ بڵێم.

وتیان: ئێمە وێرای بەهێز بوون، گەلێك ئازاو نەترسیشین؛ ئیتر فەرمانیش بە دەستی خۆتە؛ لێکی دەوە و فەرمانمان دەیە.

وتی: ئاکاری پاشایان وایە؛ کە چوونە ناو هەر شارێکەوە خاپووری دەکەن. دانشتوانیشی -ئەوەی جێی رێز و حورمەتی خەڵکی بێ- سووکایەتی پێ دەکەن، و ئەوە کاریانە. من دیارییەکیان بۆ بەرێ دەکەم با بزانین راسپاردەکان چ جوابێك لەگەڵ خۆ دێننەوە.

کاتێ گەیشتنە لای سلێمان پێی وتن: ئێوە دەتانەوێ بە پووڵ و پارە یارمەتی من بدەن؟ ئەوەی خوا پێی داوم لەوەی بە ئێوەی داوە، هێژاترە. وادیارە ئێوە بە دیاریی خۆتان دڵخۆشبن. بگەڕێنەوە بۆ لایان؛ ئێمە بە

لەشکرێکەوە دێینە سەریان، ئەوان دەرەقەتی نایەن؛ ئـەمجا بـە سـووکی و زەلیلی لەوێیان دەردەپەڕێنین.

[دوایـی پـرسی:] کـۆمـەڵی نـزیکان! کـامتان دەتـوانـن بـەر لەوە بـێن خۆبەدەستەوە دەن، تەختی ئەو ژنەم بۆ بێنن؟ زەبەلاحێك لە جندۆکان وتی: من پێش ئەوەی لە جێی خۆت هەستی ئەیگەیەنمە لات؛ بەخۆدا ئەپەرمم و دەس و دڵ پاکیشم.

یەکێ لەوانەی شتێکی لە کتێب دەزانی، وتی: ئـەمن لە چـاوتروکانێکـا بۆتی دەهێنم. کە تەماشای کرد، لە لای دانرابوو.

وتـی: ئـەمەش نـیعمەتێکـە لە پـەروەردگارمەوە، تـا دەرکـەوێ، ئـایا سپاسکارم یاکوو سپڵە. ئەوەی سپساکار بێ بۆ خۆی دەکا ئەوەش کە پێ نەزانە، پەروەردگاری من هەم بێنیازە و هەم جوامێر.

ئەوسا وتی: ئا تەختەکەی هەندێ بگۆڕن، بابزانین دەیناسێ، یان بـۆی ناناسرێتەوە.

کاتێ گەیشتە بەرەوە لێیان پرسی: تەختەکەی تۆش هەر ئاوا بوو؟

وتی: هەر دەڵێی خۆیەتی. ئێمە بەر لە ئێستەش دەمانزانی و هەر ئامادەی فەرمانبەریی بووین. ئەوەی ئەو لە رابردوودا بەجێی خوا دەیپەرست، ببووە هۆی باوەڕ نەهێنانی و لە ریزی خوانەناساندا بوو.

پێی وترا: بچۆرە ناو کۆشکەوە؛ کاتێ بۆی روانی هەرلای وابوو ئـاوە و قولی هـەڵکـرد. [سـلێمـان] پـێی وت: ئـەم کـۆشکـە لە شـووشەی سـاف سازدراوە.

وتی: ئەی خوای پەروەردگارا! من تا ئێستا زڵمم لە خۆم کردووە. ئەوا لە

ئێستاوە لەگەڵ سلێمان خۆ بە پەروەردگاری هەموو جیهان دەسپێرم».(١)

ئەمە بوو [کەسایەتی] سلێمانی پێغەمبەر، کە هەڵوێستی جۆراو جۆرتان لە پێناو بانگەشەی خواناسی و تەوحید و لێزانی و تێگەیشتنا دی و بوێرییتان بەرامبەر بە ئایین و باوەڕ بۆ دەرکەوت.

## سلێمان خوانەناس نەبوو

گەلی یەهورد سلێمانیان بە شتێك تاوانبار دەکرد، لە شانی هیچ خاوەن بڕوایەکی تاکەناسدا کە خوادڵی بۆ وەرگرتنی باوەڕ ئامادە کردبێ نەبوو، تا بگا بە پێغەمبەرێکی هەنێردراو کە خوا لێزانی پێ بەخشیبێ. ئەوان بە بۆنەی خێزانەکانیەوە بە جادووکاریی و خوانەناسی و تێکەڵی لەگەڵ هاوبەش دانەران و دوو دڵی لە تاکە پەرستیدا تاوانباریان کرد. بەڵام خوا هەموو ئەو تاوانانەی بە درۆ خست و فەرمووی: «سلێمان خوانەناس نەبوو؛ شەیتان باوەڕان خوانەناس بوون، کە مەردمیان فێری جادوو کرد».(٢)

دیسان فەرمووی: «ئێمە سلێمانمان بە خەڵات دا بە داوود، ئای چ بەندەیەکی هێژا بوو! چەند گەڕاوە و سپاسکار بوو!»(٣)

پاشان فەرمووی: «سلێمان لە خۆمان نزیکەو بێ گومان دارای ئەنجامێکی چاکە».(٤)

---

(١) نەمل: ٤٤، ٢٠.
(٢) بەقەرە: ١٠٢.
(٣) ساد: ٣٠.
(٤) ساد: ٢٥.

# بەسەرهاتی ئەیۆب و یۆنس

## بەسەرهاتی ئەیۆب

سەرگوزەشتەی ئەیۆب، جۆرە سەرگوزەشتەیەکی ترە. بەسەرهاتی ئەیۆب، لە قورئاندا بەسەر هاتێکی تایبەتی و دیارگەیەکە لە دیارگەکانی چاکەی خوا سەبارەت بە بەندە خاوەن باوەڕ و سپاسکار و خۆ راگرەکان، واتا: پێغەمبەرانی خۆشەویستی.

ئەیۆبی پێغەمبەر، [لە سەردەمانێکا] دارای ماڵ و مڵك و مەڕو ماڵاتێکی فراوان و منداڵانێکی هێژا و لە دڵ نزیك بوو، کە بەرامبەر بە هەموو ئەوانە کەوتە بەر تاقی کردنەوە و چی هەبوو بە تەواویی لە دەستی بوونەوە. ئەوسا تووشی نەخۆشی هات و لە تەواوی ئەندامانی بە دەن تەنیا دڵ و زمانی ساغ مانەوە کە شەو و رۆژ، یاد و پەسنی خوای بە دەسەلات و خاوەن شکۆی پێ دەکردن.

[وردە وردە] ئاواڵ و هاونشینانی دووریان لێگرت و لە گۆشەیەکی شارەکەدا بە تەنیا مایەوە. تاقە کەسێکی بە دەورا نەماکە [هیچ نەبێ] بێدوێنێ

و دڵخۆشییەکی بداتەوە. تاقانە کەسی ئەیۆب بووە ژنەکەی، کە بەدەمیەوە بوو، بەر بەردەستی دەکرد. ئەویش بە نیازی دابین کردنی ژیانیان ناچار کەوتبوو، کار بۆ ئەم و ئەم بکا، تاکوو شتێکیان لە بەرانبەردا لێ بستێنێ.[1]

## خۆڕاگریی ئەیۆب

ئەیۆب سەرباری گشت ئەوانە، خۆڕاگریی و سپاسکاریی لە دەست بەرنەدا. [بەو حاڵەشەوە] دەمی هەر بە گازە و شوکرانە بژێرییەوە بوو. نە ئەکڵووزایەوە، نە کەسی دەخستە زەحمەت. نە هەرگیز سکاڵای دەردەبڕی و نە تووڕەش دەبوو. چەن ساڵێك لە تەمەنی بەو شێوازە دایە سەر. لە پاڵ خۆڵەکەوانێکی هۆزی ئیسراییلدا کەوتبوو، کە مەڕو ماڵاتی بەلادا تێدەپەڕین

## مەینەت و بەینەت[2]

وەختێ ماوەی ئەو ئەزموونەی خوا بۆ ئەیۆبی لە بەرچاو گرتبوو دوایی

---

(١) ئەم چەند رستەیە هی تەفسیری «ابن‌کثیر»ە. (نووسەر).

(٢) لێرەدا بڵێین کە قورئان بە راشکاوی دەربڕی ناکا، حەزرەتی ئەیۆب تووشی چ نەخۆشییەك هاتووە. هەندێ لە راڤەکاران (موفەسیران)یش لە سەر ئەو بڕوایە نین کە ناو براو گێرۆدەی نەخۆشییەکی ئاوا ـ وەکوو لە سەرەوە ئاماژەی پێکراوە ـ بووبێ. چوون سەر چاوەی ئەم وتانە «ئیسرائیلیات»ن و هاوڕێی بەڵگەیەکی باوەڕ پێکراو نین جگە لە مەش جێی بڕوا نییە کە پێغەمبەرێك نەخۆشییەکی وەها بگرێ خەڵکی بێزی لێبکەن و دووریی لێ‌بگرن. پێغەمبەرێك لە کۆمەڵگەدا رێبەری هەمەلایەنەو جێی رازو نیازی جۆراو جۆری مەردمە. ئەگەر وابێ ئەرکی یەگجار گرنگی پێغەمبەرایەتی و راهێنانی مەردمی چۆن بۆ جێ بەجێ دەبێ.!؟

بڕوانە «مع الانبیاء فی القرآن. عفیف عبدالفتاح طبارە» لاپەڕەی ٢٠٩. «وەرگێڕ»

هات و ئەوەی مەبەست بوو بە باشی هاتە جێ. پاشان لە پێناو رازیی بوون بەوەدا بۆی بڕیار درابوو چەند پلەیەك سەركەوت، ئەوسا خوا نزایەكی گیرای، كە داماویی و بێچارەیی تیادا ئەدرەوشایەوە و پیشاندەری ئەوە بوو لە دەستی خوا جگە لە خۆی ـكە بە سەر هەموو شتدا زاڵە ـ پشت و پەنایەك نییە؛ خستە دڵیەوە.

لە ئاكامی ئەو نزایەدا خوا، تەندروستی بە خۆی و بنەماڵەی بەخشییەوە. ماڵ و دارایی بە سەر و زیادەوە بۆ هێنایەوە جێ و پیتی بە هەموو شتێكی دا.

خۆی ئەفەرموێ: «ئەیوب هاواری لە پەروەندەی كرد كە: من تووشی مەینەت هاتووم و تۆش لە هەموو دڵسۆزان دڵسۆزتری. نزاكەیمان لێ قەبووڵ كرد. نەخۆشیمان لە كۆڵ خست. ماڵ و خێزانیمان پێ دایەوە و ئەوندەی تریشمان پێ بەخشی. ئەمە رەحمەتێك بوو لە ئێمەوە و پەندێكیش بۆ ئەوانەی تەنیا بەندایەتی ئێمە دەكەن».(١)

## بەسەرهاتی یۆنس و رازەكەی

سەرگوزەشتەی یۆنس كە هاوڕێیە لەگەڵ هی ئەیۆبدا. سەلمێنەری توانایی خوا و دڵسۆزیی و بە فریاگەیشتنی بەندەكانیەتی، لە كاتی هیوا بڕاوییدا. لەو كاتانەدا وا هیچ ئومێدێك نامێنێ. رەشبینییەكی خنكێنەر و شەوە زەنگ ئاسا دنیا دادەپۆشێ. دڵپەنگاوی وای تەنگ پێ هەڵئەچنێ، نە رۆشناییەك دیلێتەوە، نە هەوایەك؛ نە ئاواتێك و نە هیوایەك. هاڕەی(٢)

---

(١) ئەنبیا: ٨٤، ٨٣.

(٢) هاڕە: بەردە ئاش.

بەهێزو بە پەلەی مەرگ ئەکەوێتە خولانەوە و دانەوێڵەی نەرم و شلی ژیان وردوهان دەکا.

ئا لەو هەلو مەرجەدا دەستی دەستەڵاتی خوای بەهێزی زاڵی دڵوڤانی لە کارزان دەردەکەوێ و ئەو مرۆڤە لاوازە لە دەمی شێری بکوژ و مەرگی لە ناو بەر، دەستێنێتەوە. وا تەندروست و بێ خەوش رزگاری دەکا، پێت وایە لە ماڵی خۆ دا بووە و لە ناو ماڵ و خێزانیدا ئاگاداریی لێکراوە!

## یۆنس لە نێوان گەلەکەیدا

بەسەرهاتی یۆنس بەم چەشنەیە کە خوا هەناردی بۆ شاری «نەینەوا»، بەڵکوو رێی خواناسی و خواپەرستی بە خەڵکی ئەوێ بناسێنێ. بەڵام ئەوان بە گوێیان نەکرد و لەسەر ستەمکاریی خۆیان هەر بەردەوام بوون.

یۆنس لێیان تووڕە بوو، وێڕای بەجێ‌هێشتنیان هەواڵی دانێ کە پاش سێ رۆژ، تووشی بەڵایەك دەبن. وەختێ دڵنیا بوون بڕیارەکەی یۆنس دێتە دی و قسەی پێغەمبەر راستە، بە منداڵ وگاوگوێر و مەڕو ماڵاتیانەوە بەرەو دەشت و دەر وەڕێ کەوتن. دایك و پێچوویان لێك جیا کردەوە. ئەوسا لە بارەگای خواداکەوتنە شین و زاریی و لێی پاڕانەوە. وشتر و بەچکەوشتر دەسیان کرد بە حیلە حیل. قۆڕە و بۆڕەی گاو گوێر بەرز بووە. مەڕ و بەرخ باڕە باڕ بۆیان سەندنەوە. لە ئەنجامدا خوا سزاکەی لەسەر لادان.

قورئان ئەفەرموێ: «بۆچی هیچ شارێك نەبوو کە باوەڕ بهێنن تاکوو باوەڕەکەیان قازانجیان پێ بگەیەنێ، گەلی یۆنسی لێ بەدەر؟ وەختێ بڕوایان

هێنا بەڵای ناشیرینمان لە دنیادا لێ لادان و ماوەیەکیش ئاسوودەمان هێشتنەوە». (١)

## یۆنس لە زکی ماسیدا

یۆنس کە رۆیشت، هاورێ لەگەڵ دەستەیەکی تر، سواری پاپۆڕێك بوو. پاپۆڕ [بە هۆی قورسی]کەوتە داچوونەوە.

[سەرنشینان] ترسی چوونە ژێر ئاو دایگرتن. بە نیازی سووك کردنی باری کەشتی پشکیان خست، تا بەر هەرکەس کەوت بیهاونە ناو دەریاوە. پشکەکە بە ناوی یۆنسەوە دەرهات، بەڵام ئامادە نەبوو بڕوا. دیسان پشکیان خست، کەوتەوە لەو و هەر بە گوێی نەکردن. بۆ جاری سێهەم خستیانەوە و دیسان هەر کەوتەوە لەو. خوا ئەفەرموێ: «لە پشك خستندا بەشداری کرد و پێوە بوو»(٢)، واتا: دۆڕاندی. دوایی یۆنس هەستایەوە جل و بەرگی لەبەر کەندو خۆی لە دەریا هاویشت. خوا ماسییەکی بۆ بەرێ کرد. بەرەو لای هات و دڕنی بە دەریا دا. هەرکە یۆنس کەوتە ناو ئاو هەڵیلووشی. خوا بە ماسییەکەی راسپارد، نە گوشتی یۆنس بخوا و نە ئێسقانیشی بشکێنێ.(٣)

## خوا نزاکەی قەبووڵ کرد

یۆنس لە ناخی تاریکی زکی ماسی و تاریکی دەریاو تاریکی شەودا

---

(١) سافات: ١٤١. (٢) سافات: ١٤١.

(٣) ئەم چەند رستەیەش هەر هی تەفسیری «ابن‌کثیر»ە. (نووسەر).

نشتەجێ ببوو. تاریکی خۆی بە سەر تاریکیدا کێشا بوو. تاریکییەکی چەند سامناك و ئەنگووستە چاو بووا ئومێدی گیان دەرکردن چەند دوور لە باوەر بووا

ئەوەندەی خوا مەیلی لەسەر بوو گوزەرا. پاشان وشەگەلێکی نایە دڵ، تاکوو تاریکی بڕفێنن؛ خەم و پەژارە راونێن و رەحمەت لە سەرەوەی حەوت ئاسمانەوە بڕێژنە خوارەوە.

گوێ گرە با قورئان ئەم رووداوە بێوێنەو سەر سوڕهێنەرەت بۆ بگێڕێتەوە؛ کە هۆی ئارامش و دڵنەواییە بۆ هەموو لێقەوماوێکی دڵشکاو. ئەو نائومێد و دڵپەنگاوانەی سەری دنیای پان و بەرینیان لێ هاتووەتەوە یەك. ئەوانەی گیانی خۆشیان لێ بووەتە بار و سوور و ئاشکراش دەبینن، جگە لە خوا هیچ پشت و پەنایەك لە ئارادا نییە.

«خاوەنی ماسی بێنەوە بیر، لەو کاتەدا کە بە تۆڕەییەوە رۆیشت و هەرلای وانەبوو ئێمە تووشی تەنگانەی دەکەین. لە تاریکاییدا بانگی کرد: [خوایە!] جگە لە خۆت پەرستوویەکی تر شك نابەم. پاکی هەر بۆ تۆیە و ئەمن لەریزی ستەمکاراندا بووم. ئەوسا فریای کەوتین و لە تەنگانەمان رزگار کرد. ئێمە باوەڕداران ئاوا دەرباز دەکەین».(١)

---

(١) ئەنبیا: ٨٨، ٨٧.

# بەسەرهاتی زەکەریا

## نزاکەی زەکەریا

نموونەیەکی‌تر لە نێعمەتەکانی خوا بۆ بەندەکانی و نیشانەیەکی‌تر لە دەسەڵاتی بێ پەڕ و سنوری، لە دوعای زەکەریادا دەردەکەوێ بۆ فرزەنێکی چاکی ئێسك سووکی دەس و دڵپاك، کە جێی بگرێتەوە و جێنشینی بەرەی یەعقووب و بانگێشتکاری تاکە پەرستی بێ.

ئەو نزایەش لەسەرو بەندێکا بوو کە زەکەریا تەمەنی چوو بووە سەرەوە. خۆی هێز و گوڕی نەما بوو، پێی تابووە پیریی و خێزانیشی لە سك و زا نشتبووەوە. [بەسەر ئەوانەدا] خوا نزاکەی هێنایە جێ. بیر و باوەڕی مەردمی لەو بارەوە بە هیچ دەرکرد و بەراوردی رابردووی پووچەڵ کردەوە. کوڕێکی وشیاری دایە، کە هەر لە تەمەنی منداڵیدا بلیمەتی و لێزانی و لەسەر خۆیی و زانست و کتێبی پێ بەخشی. بە روو خۆشی و چاکەکاریی و پاکی و خۆش رەفتاریی لەگەڵ داك و باب و دڵسۆزیی و نەرم و نیانی ناوی دەرکرد.

خوا دڵی زەکەریای تێگەیاند و چەن دیاردەیەکی پێ نیشان دا، کە

دەسەڵاتی لە بڕان نەهاتووی[١] خوایان تیادا ئەبینرایەوە. پیشانی دا چی مەیلی لێبێ ئەنجامی بە دەستی ئاسانە. لە چۆنیەتی دروست کردنی ئەندامانی لەش و لەوەی چۆن ئەندامێك ئەخاتە جموجووڵ، یاکوو لە جووڵەی دەخا، ئاگاداری کرد. بۆ زەکەریا جوان روون بووەوە کە بوونەوەر بە گشتی، لە ژێر دەستی بە هێزی خوا دایە. زیندوو لە مردوو، مردوو لە زیندوو، دەردەخاو بە هەرکەس پێی خۆش بێ رزق و بژیوی فراوان دەبەخشێ.

## نەزری ژنی عیمران

ژنی عیمران ـکە لە بنەماڵەی زەکەریا و ژنێکی چاك و پاك و دڵسۆزی ئایین بوو ـ نەزری کرد، ئەگەر کوڕێکی بوو بیدا لە رێی خوا دا، کە خزمەتی ئایین و بەرنامەکەی بکا. لەو رووەوە داوای لە خوا کرد وێڕای قەبووڵ کردنی ئەو کوڕەی، وای بگێڕێ ببێتە هۆی بەهرەگەیاندن بە دینەکەی و بەندەکانی. بیکاتە بانگێشتکاری رێی خوا و پێشەوایەکی رێپیشاندەر.

## وتی: خوایە! خۆکچت پێدام!

ژنی خواناس شتێکی دەویست و مەیلی خوا لەسەر شتێکی دیکە بوو. [ئاشکرایە] خواش ئاگادارترە بەسەر بەهرە و زیانی بەندەکانی دا. کە دیتی کچی بووە خەم دایگرت و کەوتە ناو پەژارەیەکی قووڵەوە. بەڵام کچەکەی

---

(١) لە بڕان نەهاتوو: نەبڕاوە.

مرۆیەکی ئاسایی نەبوو، لە ئەنجامی ئەرکە دینییەکاندا زۆر بە توانا و لە مەیدانی خزمەت بە کۆمەڵدا ئازا و دڵاوا و لە زۆرینەی گەنجان لێهاتووتر بوو. خوا ـلەبەر ئەو رازەی خۆی دەیزانی ـ مەیلی لێ بوو کچ بێ و ببێتە دایکی پێغەمبەرێکی شیاو و پایەبەرز. چوون تەنیا لە توانای پیاواندایە کە بەرێوەبەری ئەرکی پێغەمبەریی بن.

ئەوکاتە ژنی عیمران وتی: پەروەردگاری من! ئەو منداڵەی لە زکم دایە دەیکەمە نەزری تۆ. بە هیوام لێم قەبووڵ کەی؛ بیسەر و ئاگادار هەر خۆتی. وەختێ منداڵەکەی بوو، وتی: پەروەرێنی من! ئەوا کچم بووە! ـخواش ئاگادارترە لەوەی بوومە ـ دیارە کچیش جێی کوڕ ناگرێتەوە. من ناوم‌نا مریەم. ئەویش و بەرەشی بە خۆت ئەسپێرم، تا لە شەیتانی لەعنەتییان بپارێزی.

## لە ژێر سێبەری دلۆڤانی خوادا

مریەم، بە هۆی ئەو کەسایەتییەی، کەوتە ژێر سێبەری دلۆڤانی خوا و سەرپەرستی زەکریاوە. پەروەرندە بە نیازی سەلماندنی دڵسۆزیی خۆی بەمریەم، میوە و خواردەمەنی جۆراو جۆری لە غەیری وەرز و جێگای خۆیدا بۆ بەرهەم ئەهێنا، کە هەم لێی ئەخواردن و هەم لێشی دەبەخشین.

«پەروەرێنی پێشکەشییەکەی زۆر بە باشی لێ وەرگرت و کچەکەی دڵسۆزانە بۆ بەخێو کرد و زەکەریای کردە سەرپەرستی. هەرکاتێ [زەکریا] سەری میحرابی ئەدا، میوەی لە لادا ئەیبینی، کە لێی ئەپرسی مریەم ئەمەت لە کوێ هێنا؟ ئەیوت: لەلایەن خواوە بۆم هاتووە. خوا بۆ هەر کەس پێی

خۆش بێ، بژیوی فراوان دەنێرێ».[١]

## هەواڵێك لە لایەن خوای دلۆڤانەوە

خوا، زەکەریای -کە پێغەمبەر و پیاوێکی بە ئاوەز و تێبین[٢] بوو- تێگەیاند، ئەو کەسەی توانی لە گەنجێکی چاکەکار ئاوەها رێز بگرێ پێشکەشی دایکی پاڵاوتە بکاو نزاکەی بێنێتە جێ. بە هەناردنە بەردەستی میوە لە غەیری وەرزی خۆیا بەندایەتییەکەی پاڵاوتە بکا. دەشتوانی بە پیرە پیاوێکی بە ساڵاچووی هێز و گوڕ تیا نەماو -باوەکوو بە هۆی تێپەڕبوونی تەمەنی خۆی و نەزۆکی ژنی و بەراوردی هەمیشەیی، ئومێدێك لە ئارادا نەمابێ، پیاوێك لە بار و دۆخێکی وەهادا ببێتە دارای منداڵ-کورێك ببخشێ.

زەکەریا خۆشی کەوتە دڵ. مەردایەتی بووژایەوە. ئاواتی گەشەی سەندەوە و بڕوا بە خوای پتەوترەوە بوو. دەستیکرد بە خوێندنی دۆعایەك، کە ئامینەکەی فریشتەکان ئەیانوت و دڵسۆزیی خوای ئەخستە جووڵەوە. هەموو ئەوانەش هەر بە مەیلی پەروەرێنی دلۆڤان و ویستی دەسەڵاتداری هەرە زانا ئەهاتنەجێ.

هەر لەوێدا زەکەریا لە پەروەرندەی پاڕایەوە و وتی: «پەروەرندەی من! بەرەیەکی هێژام پێ ببخەشە؛ ئەتۆ بیسەری هەموو پاڕانەوەیەکی».[٣]

---

(١) ئالی‌عیمران: ٣٨.

(٢) تێبین: ورد بین، رۆشنبیر.

(٣) ئالی‌عیمران: ٣٨.

## مزگێنی منداڵ

خوا دۆعاکەی زەکەریای قەبووڵ کرد و مزگانی کوڕێکی چاك و پاکی، کە لە داهاتوویەکی نزیکا لە دایك دەبی دایە. «مرۆ، بە پێی سرشتی خۆی هەر بە پەلەیە».(١) بۆیە خێرا داوای لە خوا کرد، نیشانەی هاتنەجێی ئەو رووداوە گرنگە و کاتی نزیك بوونەوەی پێ راگەیەنێ.

وتی: «پەروەرێنی من! نیشانەیەکم بۆ دابنێ. فەرمووی نیشانەکەی ئەوەیە کە سێ رۆژ ناتوانی لەگەڵ کەس قسە بکەی، بە ئیشارە نەبێ. لە ئێوارە و بەیانیدا یادی خوا بکەو پەسنی بەجێ بێنە».(٢)

ئەو خوایە کە دەتوانێ زەمینە و لێهاتنی تایبەتی لە هەر شتێك بستێنێتەوە؛ زمانی بە دەم و دوو والەکارخا، نەتوانێ تاقە وشەیەك دەربڕێ؛ دەشتوانێ لێهاتنی تایبەتی بە هەر دروستکراوێکی خۆی ببەخشێ. ئەو خاوەن دەسەڵاتەکە لێسەندنەوەی بە دەست ئاسانە، پێدانیشی هەر بە دەست ئاسانە.

## نیشانەکانی دەسەلاتی خوا

نیشانەکانی خوا و دەسەڵاتی خوا، لە پێشا لە زەکەریادا و پاشان لە ماڵ و خێزانیا دیاریان دا. یەحیا لە دایك بوو، و بوویە هۆی رووناکی چاوانی و ئەمجا هێزو پشتوانێکیش بۆ ژیاندنەوەی بانگەشەکەی. بالێرەدا ئەم

(١) ئەنبیا: ٣٧.

(٢) ئالی‌عیمران: ٤١.

بەسەرهاتە جارێك بە کورتی و جارێکی‌تر بە درێژا، لە زمانی قورئانەوە ببیستین.

«زەکەریا بێنەوە بیر، کە پەنای بە پەروەردگاری برد و وتی: پەروەردگای من! بە تەنیام مەهێڵەوە؛ تۆ باشترین کەسێکی کە هەردەمێنی. نزاکەمان لێ قەبووڵ کرد و یەحیامان پێ بەخشی و خێزانیمان خۆش کردەوە. چوون ئەوان لە چاکەکارییدا خێرا بوون. بە ئومێدو ترسەوە لێمان دەپاڕانەوە و لە بەرامبەرمانەوە لارە مل بوون».(١)

## خۆڕاگریی یەحیا لە پێناو دژواریی بانگەشەدا

کاتێ یەحیا لە دایك بوو، رۆشنایی هاویشتە دڵی داك و بابیەوە. وێڕای ئەوەش، بوو بە جێگری باوکی هێژای و لە پێناو بانگەشە بۆ رێی خوا و ئایینی پاك و رەسەندا، بە تواناو خۆڕاگر بوو. هێشتا منداڵ بوو نیشانەی پیاوەتی و ئاکار چاکی تیا دیاریی داو هەر لەو تەمەنەدا ئەوینداری فێر بوونی زانست بوو. لە بواری چاکەکاریی و خۆ پارێزییدا هەڵکەوتەی ناو جوانان بوو. سەبارەت بە روو خۆشی و مەردم دۆستی و خزمەتی داك و باب، بە نمونە ئەهێنرایەوە. خوای بەرز و بە شکۆ بە یەحیای فەرموو: «ئەی یەحیا! کتێبەکە توند و تۆڵ بگرە. دیسان ئەفەرموێ: هەر لە منداڵیشا فێری لە کارزانیمان کرد. لە لایەن خۆمانەوە دڵسۆزیی و دەس و دڵ پاکییمان پێ بەخشی و مرۆیەکی پارێزگاریش بوو. رەفتاری لەگەڵ داك و بابی خوا پەسند

---

(١) ئالی‌عیمران: ٩٠، ٨٩.

و لە توندیی و نافەرمانی، بە دوور بوو. سەلامی لێبێ، ئەو رۆژەی لە دایك بوو، ئەو رۆژەی دەمرێ و ئەو رۆژەش زیندوو دەکرێتەوە».(١)

(١) مریەم: ١٢، ١٥.

# عیسای کوڕی مریەم

## ڕووداوێکی نائاسایی

ئەمجا نۆرەی خستنە بەرباسی هەڵسو کەوتی عیسایە، کە دوایین ڕاسپاردەی بەر لە موحەممەدە (درودی خوای لێبێ). بەسەرهاتەکەی، ویستی خوای بە تواناو دەسەڵاتێکی بێ پەڕو سنوور و لێزانیەکی ناسکی تیادا ئەدرەوشێتەوە. کار و باری عیسا بە گشتی نائاسایی بوو.

هرز[١] و ئاوەز لە بەرامبەر چۆنیەتی لە دایك بوونیەوە دەبەزن و واقیان وڕ دەمێنێ. یاساکانی سرشت هەڵدەپێچرێن و لە کار دەکەون. ئاشکرایە بۆ ئەوکەسەی یاساکانی سرشت بە پەرستوویەکی هەر بوو دەزانێ و بەراوردە ڕواڵەتی و دیاردە پژشییەکان بە ڕاسییەکی نەگۆڕو هەتا هەتایی دادەنێ و لە توانای خوا بێ خەبەرە، بڕوا بەوکارە نائاسایی و قانوون شکێنانە و دان پێدا نانیان، گەلێك دژوارە. بەڵام لە توانای هیچ هۆکار و هیچ دیاردەیەکا نییە

---

(١) هرز: فکر، بیر.

بەربەویستی خوا بگرێ.

«هەرکاتێ بییەوێ شتێك دروست بێ کە فەرمانی دا بیە دەست بەجێ دروست دەبێ».[(١)]

بڕوا بەم ڕاستییەش بۆ ئەوانەی باوەڕێکی تەواویان هەیە، کە خوا بە دەسەڵاتێکی زاڵی بەدیهێنەری سەر لە بەری جیهانە، شتێکی زۆر ئاسانە.

«[چوون دەزانن] هەر ئەوە خوای خۆلقێنەری نوێسازی وێنەگەر. جوانترین ناوەکان هی ئەون و چی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە، خەریکی پەسنی پاکی ئەوە و بە دەسەڵاتی لەکارزان هەرخۆیەتی».[(٢)] ئەوەی بڕوای بە وە دیهێنانی ئادەم و حەوا لە ئاوو گڵ ـبەبێ داك و باب ـ هەبێ، لە دایك بوونی منداڵێك لە دایك و بە بێ باوکی، لا زۆر باوەڕ پێکراوترە، تا لە دایك بوون بەبێ داك و باب. بەو بۆنەوە قورئان دەڵێ:

«دروست بوونی عیسا بە دەستی خوا، لە چەشنی دروست بوونی ئادەمە، کە لە گڵی دروست کرد. پاشان پێی وت: ببە، ئەویش هاتە ئارای بوونەوە».[(٣)]

## کاروبار هەمووجێی سەرسوڕمانن

بەسەرهاتی عیسا بە گشتی، سەرسوڕهێنەرە. لە دایك بوونی لەسەر و بەندێکا رووی دا، کە «یۆنان» لە زانستە عەقڵییەکان و زانستی ژمارەدا گەیشتبوە لووتکەی پێشکەوتن و زانستی پزشکیش لەو وڵاتەدا، لە جەنگای بگرە و بەردەی خۆیا بوو.

---

(١) یاسین: ٨٢. (٢) حەشر: ٢٤.
(٣) ئالی‌عیمران: ٥٩.

## ملکەچی یەهوود لە ئاستی هۆکارە رواڵەتییەکاندا

گەلی یەهوود ئەگەرچی پێغەمبەری زۆریشان تیادا هەڵکەوتبوو، بە تەواوی خۆیان سپارد بوو بەو زانستە بەکەڵکانەی لەو رۆژەدا باویان هەبوو. سەبارەت بێباوەڕی بە رۆح و ئەوەی پەیوەندی بە رۆحەوە هەبوو ناویان دەرکردبوو. وا راهاتبوون لێکدانەوەیان لەسەر هەر بابەتێك و هەر شتێك، لێکدانەوەیەکی مادیی بوو. لایان وابوو، هەر دیاردەیەك بێ گومان دەبێ هۆیەکی مادیی هەبێ و هیچ شتێك بەبێ هۆکار و سەبەب هەرگیز وەدی نایە. ئەو موعجیزانەی خوا حەزرەتی عیسای پێ رێز لێ گرتن چارە سەرێك بوو، بۆ هێنانە سەر خۆی عەقڵی بەرچاو تەنگی مادیی،کە پێویستی سەردەم و بانگەوازی رۆژگار بوو.

یەهوود بۆ ناسینی رواڵەتی هەر شتێك بە وردیی خەریکی تاقی کردنەوە دەبوون. خۆیان ئەکوتا بۆ توێکڵ و لە کاکڵیان نەدەپرسی. هەر خوازیاری رواڵەتــی دوور لە راز و راســتی بــوون. ورکــەی خوێن پــەرستی و نــەژاد پەرستییان گەیاندبوە ئەوپەڕی. لە بواری ماڵ دۆستییا ویژدانیان وەلا نابوو. هێند وشك و دڵرەقیان لێ دەرهاتبوو، نە دڵیان بۆ هەژاران دائەچڵەکا و نــە فەقیر و بێدەستیان ئەکەوتەوە بیر. ئەوەی لە نەژادی ئیسرایــیل نــەبایە، بــە چاوی جانەوەر و سپلۆت و تەنانەت شتێکی بێ گیان بــۆیــان دەڕوانــی. لە ئاستی دارا و بە دەسەڵاتا لارە مل و بەرانبەرکز و داماوان، تووش و بە دەمار بوون. کاتێ دەسەڵاتداریی بێ بەزەیی و لە وەختی بێدەستییا نەرم و نییان بوون.

چوون ماوەیەکی دوور و درێژ هەم لە سووریەو هەم لە فەلەستین لە ژێر دەستی «رۆم»دا ژیا بوون، بە ئەخلاقی بەندایەتی و زەبوونی داهاتبوون. رەفتاریان تێکەڵ بوو لەگەڵ دوو روویی و زمان لووسی و فێڵبازیی و فریو و پیلانگێڕیی دا.

## سووکایەتی و ملە پێچی

لە ناو گەلی جوولەکەدا، سووکایەتی بە پێغەمبەران و تەقالا بۆ بە سەرا زاڵبوونیان ببوو بە باو. پاشان کارگەیی بە سوو خواردن و لووتەلایی لە راهێنانە ئایینیەکان و وشکی و لاساریی و دڵڕەقی و کوشتنی پێغەمبەران. سەرەنجام نەمانی ئەوینی پاکی خوایی لە دڵ و دەروونی زۆرینەیانا و وەلانانی سۆزی مرۆ دۆستی، تەنانەت لە نێوان باب و فرزەندا.

خەریك بوون مانای دۆستی و برایەتی و چاکەکاریی و جوامێرییان بە تەواویی لە بیر دەکرد. هەر چەند بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی هەبوو، و پێغەمبەرانێکی زۆریش لە ناویانا سەریان هەڵدا بوو، کتێبەکانیشیان پڕ بوون لە بەسەرهاتی ئەو راسپاردانە؛ بەڵام لەم دوایانەدا تەنیا ئەو باس وبابەتانەیان بە راست دەزانی کە پاڵپشتی هەواو هەوسی ئەوان بوون و لەگەڵ داب و ئەخلاقیان یەك دەکەوتن. ئەگەر کەسێکیش رەخنەی لێ بگرتایەن، راست و چەپی وە بیر بهێنایەنەوە و بەرە و ئایینی رەسەن و هاتنەوە سەر ڕێ بانگی بکردایەن لەگەڵی بە شەڕ دەهاتن و ئەبوون بە دژمنی، لە قسە هەڵبەستن و تاوانبار کردن و خۆ لە راستی گێل کردن و شایەتی درۆدا دەستێکی باڵایان هەبوو.

## چاکەی خوا لەگەل تۆرەمەی ئیسراییل

تۆرەمەی ئیسراییل، بە هۆی باوەڕی تاکەپەرستییان، لە هەر سەردەمێکا، لەگەڵ نەتەوەکانی هاوچەرخی خۆیان جیاوازییان هەبووە و رازی بانتر بوونیان لە گەلانی دیکەش هەر ئەوە بووە. بۆیە خوا ئەفەرموێ:

«ئەی بەرەی ئیسراییل! ئەو چاکەیەی لەگەڵم کردن بێننەوە بیر؛ لە چاو خەڵکی هەموو دنیا زۆرترم رێز لێگرتن».(١)

## سپلەیی لە پێناو چاکەدا

بەڵام بە هۆی دراوسێیەتی و تێکەڵاویی لەگەڵ هۆزە هاوبەش دانەرەکان و بە سەرچوونی ماوەیەکی زۆر لە دەمی ژیانی پێغەمبەران؛ بیرو باوەڕی هەڵبەستەو ئەخلاقی رۆژگاری نەزانی، کاری تێکرد بوون. لە میسردا ملیان لە گوێرەکە پەرستی ناو لە مەڕ بە پیرۆز زانینی «عوزەیر» و رێز بۆ دانانی، گەلێکیان هووشەکردو لە پلەی ئادەمیزادیان تێپەڕاند.

[لە ئاکامدا] بێ ئەوەی بیرێك لە باس و خواستی لای خوا بکەنەوە، دایانە باری بێشەرمی و هەندێ کردەوەی بت پەرستانە و جادوو و ستەم و چەند کاری ئاوڕوو بەرانەی تریان بە ئاکاری هەندێك لە پێغەمبەران راگەیاند.

## دەمارگرژیی و بادیهەوایی

گەلی یەهوود سەرباری هەمو ئەوانە بە باوو باپیرانیانەوە لە رادە بەدەر

(١) بەقەرە: ٤٧.

دەنازین و بە ئاوات و خەیاڵە پڕ و پووچ و خەونە دوور لە راستییەکانیان پشتیان بەستبوو. ئەیانوت: «ئێمە فرزەن و خۆشەویستی خواین».(١) «ئێمە ئاگرمان پێ ناگا چەند رۆژێك نەبێ».(٢)

## لە دایك بوونی عیسا، سەلمێنەری ناسەربەخۆیی جیهانی مادیی.

لە دایك بوونی عیسا و چۆنیەتی ژیان و بانگیشتی، ئەم دیاردانەی خوارەیان کۆڵ پێ داو لە برەویان خستن.

دیاردە مادیی و ناسراوەکان. ئەخلاق و ئاکاری جێ کەوتوو. یاسا دامەزراوە بەبرەوەکان. ئەو ئاوات و بەرزە فڕییانەی جوولەکە پشتیان پێ بەستبوون و ئەو داب و نەریتانەی لە ناو کۆمەڵدا کێبەرکێ و تەنانەت شەڕیان لەسەر دەکردن.

عیسا بە تەرزێکی نائاسایی لە دایك بوو. لە ناو لانکدا لەگەڵ مەردم کەوتە دوین. لە باوەشی دایکی هەژار و لە دنیا بڕاویدا پەروەردە بوو. لەکەش و هەوایەکی پڕ لە تانەو تەشەر و ناو و نیتکە شوێن خستنا ژیانی دایە سەر. لە هەرچی پێوەندی بە دەسەلات و دەوڵەمەندییەوە بوو، بە دوور بوو.

لەگەڵ فەقیر و بێدەستان دەژیا. نان و ئاوی لەگەڵ ئەخواردن و ئاواڵ و دڵسۆزیان بوو. دۆست و پشتیوانی ئاوارەو لێقەوماوان بوو. گەدا و دەوڵەمەند؛ فەرماندەر و فەرمانبەر، لات و ماقووڵ، لەلای بێ تۆفیر بوون.

---

(١) مائیدە: ١٨.　　(٢) بەقەرە: ٨٠.

## موعجیزەکانی عیسا

خوا بە ناردنی پەیام بۆ عیسا و گەیاندنی بە پێغەمبەریی؛ پلە و پایەی بەرز کردەوە و بە ئینجیل و موعجیزە سەرسور هێنەرەکانی پشت راستی کردەوە.(١)

خواوەن بە دەستی عیسا، ئەو نەخۆشینانەی بۆ پزیشکان چارە سەر نەدەکران و کوێریی زکماك(٢) و نەخۆشی پیسی چادەکردەوە و مردووشی دەژیاندەوە.

لە پێش چاوی خەڵکی باڵندەی لە قوڕ دروست دەکرد؛ پاشان فووی پیادەکرد و بە ئیزنی خوا دەبوو بە باڵندەیەکی بە راستی. بە مەردمی رادەگەیاند کە چ دەخۆن، یاکوو لە ماڵی خۆدا چیان پاشەکەوت کردووە.

ئەنجامی ئەو کارانە بڕوای مەردمی بەرانبەر بەوەی تەورات سەبارەت بە موعجیزەی پێغەمبەران و توانای خوا دەریبڕی کرد بوو، تازەتر و پتەوتر کردەوە و بڕوای [پەڕگیرانە] بە مادە و تەجرەبەی ـ وەکوو کارتێکەرێکی بێ سەرەو سەربەخۆ ـ خستە لەرزە و شەکەوە. بەڵام ئەوانەی خوایان بە تاکە دەسەڵاتدار و بەڕێوەبەری جیهان نەدەزانی، دیسان ئەیانوت: ئەمانە بابەتێکی تازەیان تیا نییە و ئێمە شتێکی وامان لێیان دەسگیر نابێ.

---

(١) پشت راستن کردنەوە: دانەپال، تەئیید.

(٢) زکماك: زکی دایکی، مادرزاد.

## بانگەوازی عیسا و بەرهەڵست وەستانی جوولەکان

عیسا یەهوودی لە زۆرێك لەو شتانەداکە بەرهەمی خەیاڵی خۆیان بوون و بایەخی لە رادە بەدەریان پێ ئەدان، یا لەبەرەوا زانینی شتگەلێکا، کە خوا بە نارەوای راگەیاند بوون، یان پێچەوانەکەی، بە درۆ خستنەوە. تێکۆشا لە بنەمای دین و راز و پەیامی دین تێیانگەیەنێ تا خوایان لە هەموو شت لا گرنگتر و خۆشەویستر بێ. رێز و بایەخی شیاو بۆ مرۆڤایەتی دانێن و یاریدەری هەژارو بێدەستان بن. پەی بە تاکە پەرستییەکی پاك و بێ گەرد بەرن و ئایینی پەیامبەران لە هەموو رەنگ و ژەنگێکی دەمی نەزانی و بیر و باوەڕی پووچەڵ پاك بکەنەوە.

## یەهوود ئالای دژمنایەتی بەرامبەر عیسا بەرز کردەوە

جوولەکە بیر و رای عیسایان یەکجار پێ ناحەز بوو. تێکڕا لەگەڵی بە شەڕ هاتن و بە جارێ دەسیان دایە تیر بۆ هاویشتنی، تاوانباریان کرد و بارانی جنێوی جۆراو جۆریان بە سەرا باراند. دایك [مریەمی پاك]یان دایە بەر تانەو تەشەر. کەسایەتی حەزرەتی عیسایان پێچەوانە بە مەردم دەناساند. خوت و خوێرییان هەڵنا، کە سەرە رێگەی پێ بگرن و دەردیسەری بۆ سازکەن.

## هەڵسوکەوتی حەزرەتی عیسا لە قورئاندا

دوایی لێبڕان بیکوژن و خۆیانی لە دەست رزگار کەن. بەڵام خوا پشتیوانی لێکرد و شەڕیانی ئاراستەی خۆیان کردەوە. بەرەو لای خۆی

بەرزوەکرد و رێزی شیاوی لێنا. چۆنیەتی ئەم هەڵسو کەوتە لە قورئانی پیرۆزدا بخوێنەوە.

لە و کاتەدا فریشتەکان وتیان: «مریەم! خوا لەلایەن خۆیەوە مزگێنی منداڵێکت ئەداتێ کە بە ناوی عیسای پاکی کوڕی مریەم ناو دەردەکا و لە هەر دوو جیهان خاوەن پایەیەکی بڵندە و لە نزیکانی پەروەرێنیەتی. هەر لە بێشکەدا لەگەڵ مەردم قسان دەکا. لە نێوان ساڵییا دەبێتە پێغەمبەر و لە ریزی پیاوە هێژاکاندایە. وتی: پەروەرێنی من! جا چۆن دەبمە دارای منداڵ؛ من تا ئێستا هیچ پیاوێکم لێ نزیك نەبووەتەوە؟! وتی: خوا هەرچی حەز بکا دەیخولقێنێ؛ ئەگەر مەیلی لەسەر شتێك بوو، هەر کەوتی ببە، بە دەست و برد دەبێ. هەر خۆشی کتێب خوێندنەوە و لە کارزانی و تەورات و ئینجیلی پێ فێردەکا. ئەیشیکا بە راسپاردەیەك بۆ سەر نەتەوەی ئیسراییل [کە پێیان راگەیەنی] ئەمن لە لایەن پەروەردگارتانەوە نیشانەیەکم بۆ هێناون. لە قوڕ شکڵی باڵندەیەکتان بۆ ساز دەدەم، کە فووم تێکرد دەبێتە باڵندە. هەر بە ئیزنی خوا ئەوەی بە کوێریی لە دایك بووە و پێست بەڵەکیش چا دەکەمەوە. مردوو زیندوو دەکەمەوە و لەو شتانەش لە ماڵەوە بۆ دواترتان داناون ئاگادارتان دەکەم. بێ گومان هەرکام لەوانە نیشانەیەکن، ئەگەر بڕواتان هەبێ. [دەبێژێ:] بەم تەوڕاتەی کە لەلامە و پێش لە من هەنێردراوە بە باوەڕم و هەندێ لەو شتانەش کە لێتان قەدەغە کراوە، بۆتان رەوا رادەگەیەنم. من نیشانەم لە پەروەرندەتانەوە بۆ هێناون. کەوایە شەرمی خوا بتانگرێ و لە قسەم دەرمەچن. وەرن بەندایەتی ئەو خوایە بکەن کە پەروەرندەی منیش و ئێوەشە؛ رێگەی [سەربەرزی و بەختەوەری] راست هەر ئەمەیە.

کاتێ عیسا لاساریی و ملەپێچیی تیادا بەدی کردن؛ پرسی: کێ بۆ [بانگەشەی] ڕێی خوا یاریم دەدا؟ حوارییەکان وڵامیان دایەوە: ئێمە لە ڕێی خوادا پشتیوانتین. بڕوامان بە خوا هەیە و تۆش بزانە خۆمان بەو سپاردووە.

پەروەرندەمان! بەوەی هەناردووتە بڕوامان هێناو شوێنکەوتووی ڕاسپاردەکەتین، تۆش بمانخە ریزی شایەتەکانەوە. ئەوان فێڵیان کرد و خواش فێڵی لێکردن؛ دیارە فێڵی خواش زاڵە بە سەر هەموو فێڵاندا.

پاشان خوا فەرمووی: عیسا! من بۆ لای خۆمت هەڵدەبڕم و لە تۆمەتی ستەمکارانت پاك دەکەمەوە. [لە ئێستاوە] تا ڕۆژی پەسڵان ئەوانەی پێڕەوی تۆن بەسەر ئەوانەدا لە ڕاستەڕێ لایاندا، سەردەخەم. دوایی دێنەوە بەر دەستی خۆم و ئەوسا ئەو بابەتانەی کێشەتان لە سەردەکردن، بۆتان ڕوون دەکەمەوە. ئەوانەی ستەمکارن، لە دنیاش و لە قیامەتیش ئازاری سەختیان پێ دەچێژم و هیچ لەسەرکەرەوە یەکیشان نییە. ئەوانەش کە خاوەن باوەڕو کردەوە چاکن پاداشی خۆیان دەسگیر دەبێتەوە. خوا لە کۆمەڵی ستەمکاران بێزارە.

ئەو شتانەی بۆمان خوێندیەوە لە دیاردەکانی خوا و پیشاندەری ڕێی کارزانین.

بێ گومان دروست بوونی عیساش بۆ خوا، چەشنی دروست بوونی ئادەمە کە لە خاك سازی دا و ئەوسا پێی وت: ببە بە ئادەم و ئەویش بوو. ئەوەی [سەبارەت بە عیسا ڕاگەیەنرا] ڕاستەو لەلایەن خواوەیە؛ لێی دوودڵ مەبە».(١)

(١) ئالی عیمران: ٦٠، ٤٥.

## ڕێو ڕەوشت و بانگەشەی عیسا لە قورئاندا

چۆنیەتی ئاکار و بانگێشتی عیسا لە قورئاندا وەخوێنە؛ کە خـوا خـۆی ئەیخاتە بەرچاوان و ئەفەرموێ: «[عیسا] وتی: ئەمن بەندەیەکی خوام، کـە هەر خۆی کتێبی پێ داوم و کردوومی بە پێغەمبەر. لە هەر کوێ بم، خوا فەڕ بەکار و بارم دەبەخشێ و پێی سپاردووم هەتا دەمێنم نـوێژ بـەجێ بێنـم و زەکات بدەم و لەگەڵ داکم ڕەفتاری خواپەسندم هـەبێ؛ [پـەروەرێن] بـۆ ملهوڕیی و لە ڕێ دەرچوونی دروست نەکردووم. سەلامم لێ بێ ئەو ڕۆژەی کە چاوم بە دنیادا هەڵێنا؛ ئەو ڕۆژەی دنیا بەجێ دێڵم. ڕۆژێکیش کە زیندوو دەکرێمەوە».(١)

## بەربەرەکانێی لە مێژینە

هەموو ئەو شەڕ و کێشانەی بۆ پێغەمبەرانـی بـەر لە عـیسا پـێشـهاتبوو، هاتنەوە ڕێی ئەویش. سەر هۆز و پیاوماقووڵان دووریان لێ گرت و خاوەن مڵك و دەسەڵاتدار، لێی تەواسانەوە. [چوون] بڕوا پێ هێنان و شوێن کەوتنی عیسایان بە عەیب و شوورەیی دەزانی و وەلانانی پلەو پایەی کۆمەڵاتـی و چینایەتی و ناوو سەرناو(٢) و کەش و فشیان(٣) لە ڕادە بەدەر پێ گران بوو. ئەوەتا کە خوا ئەفەرموێ: «هەرگیز پێش نەهاتووە ئێـمـە ڕاسـپاردەیەکـمان بنێرینە کۆمەڵگایەك و خۆشگوزەرانەکانی ئەوێ نەڵێن ئێمە بـەو قـانوون و

---

(١) مریەم: ٣٣، ٣٠. (٢) سەرناو: لەقەب.

(٣) کەش و فش: فیز و دەمار.

بەرنامەی تۆ هێناوتە بێ بڕواین. یاکوو ئەڵێن: ئێمە هەم داراییمان لە تۆ زیاترە و هەم منداڵیش کەوایە [چوون خاوەن دەسەڵاتین] تووشی سزا و زیان نابین».[١]

## بڕوای خەڵکی ئاسایی و هەژار و بێدەستان

عیسا لە دەست ئەوانە وەڕەز بوو. ستەم و سەربزێوی لێ بینین و سەرنجی دا ئەو نیشانە سەرسوڕهێنەرانەی بۆی هێناون، هەر چەن دڵنیایان دەکا، هەر بە درۆی لە قەڵەم دەدەن. ئەمجا چوون خۆشی دارایی و دەسەڵاتێکی نییە بە چاوی سووک بۆی دەڕوانن. [لە ئەنجامدا] لای کردەوە بە لای خەڵکی ئاسایی و بە تایبەت بێدەستاندا.

مەردمی ئاسایی، بە ئارەق رشتن و رەنجی شان و باهوو، بژیوی خۆیان دابین دەکرد. بە باب و باپیر نەدەنازین و پلەو پایەی کۆمەڵایەتیش بایەهەوای نەکرد بوون. مەردمێکی دڵپاك و ئێسك سووك بوون. هەر بۆیە کۆمەڵێك لە وانە بڕوایان پێهێنا، کە لە جل شۆر و ماسیگر و وردە سنعەتکار و شتی وا پێك هاتبوون.

## ئێمە هاریکارانی خواین

ئەو دەستەیە کە باوەڕی خۆیان بە [پێغەمبەریی] عیسا دەربڕی، دەوریان دایە دەوری. دەستیان نایە ناو دەست و رایانگەیاند: ئێمە هاریکارانی خواین.

---

(١) سەبەء: ٣٥، ٣٤.

قورئان ئەفەرموێ: «کاتێ عیسا هەستی ستەمکاریی لە دەسەڵاتداران کرد، پرسی: کێ لە رێی خوادا یاریم ئەدا؟ حەوارییەکان جوابیان دایەوە: ئێمە هاریکارانی خواین. باوەڕمان بە خوا هێناوە و تۆش ئاگادار بە ئێمە خۆمان بە خوا سپاردووە. پەروەرێنمان! ئەوا بە وەی بەڕێت کردووە باوەڕمان هێناو فەرمانبەری پێغەمبەرتین. ئەتۆش بمانبە ریزی شایەتەکانەوە».(١)

## گەشت و بانگەواز

حەزرەتی عیسا زۆر بەی وەختی خۆی بە گەڕاندا ئەدایە سەر. لە لایەکەوە ئەچوو بۆ لایەکی‌تر و تێدەکۆشا گەلی ئیسراییل لە تاکە پەرستی تێگەیەنێ و رێی بەندایەتی پەروەردگار، بە پەرت و لە رێ ترازاوان پیشاندا. ئەو گەشت و هات‌و چووانەی هاوڕێ بوو لەگەڵ ئاسانی و دژواریی و تەنگانەو ئاسوودەییدا. بەڵام ئەو لە هەر بارو دۆخێکا هەر یە تاقەت و خۆڕاگر بوو. سپاسی خوای بەجێ ئەهێنا و برسییەتی لە خۆ گوارا دەکرد. هەر ئەوەندەی بژیو پێویست بوو، کە لە برسانا تیا نەچێ.

## حەوارییەکان خوازیاری سفرەی ئاسمانی دەبن

بەڵام حەوارییەکان، ئەو خۆڕاگریی و بە کەم ساچان و سەختی لە خۆ گوارا کردنەی عیسایان نەبوو. بەو بۆنەوە هەر کە تووشی کەم و کۆرییەك دهاتن هەڵیان دەپێچا لە خوا بپاڕێتەوە سفرەیەکیان لە ئاسمانەوە بۆ بەرێکا،

(١) ئالی‌عیمران: ٥٣، ٥٢.

با هەر کاتێ برسییان بوو [خواردن] بخۆن و تێر بن و پاش هەر تەنگانەیەك خێرا بگەن بە خۆشی و تێر و تەواویی.

## بەدفەڕیی

خواستی حەوارییەکان لە رووی راستییەوە نەبوو. ئەیان پرسی: ئەرێ عیسا! لە توانای پەروەرندەی تۆدا هەیە لە حەواوە سفرەیەکمان بۆ بنێرێتە خوار؟!

عیسا داخوازەکەیانی لا سەیر نەبوو؛ بەڵکوو چۆنیەتی دەربڕینی داخوازەکەی پێ ناحەز بوو. پێغەمبەران بە گشتی پیرەوانی خۆیان وا راهێناوە کە بڕوایەکی تەواویان بە جیهانی نادیار [غەیب] هەبێ و ئەوەیان وەکوو باوەڕێکی بنەڕەتی و حاشا هەڵنەگر پێ ناساندوون.

موعجیزەکانیش خۆ رووداوی ئەفسانەیی نین کە منداڵیان پێ هێدی[1] بکرێتەوە؛ یاکوو بینە هۆی سەرگەرمی مەردمی سەرسەریی و کەم ئاوەز. بەڵکوو نیشانەگەلێکی خواییین کە لە هەر هەلو مەرجێکا خۆی مەیلی لێ بێ، بە دەستی پێغەمبەران ئەیان نوێنێ. نیشانەی خوا بۆ بەندەکانی دەردەکەوێ و ئەوسا ئیتر دەرفەتێك بۆ دوودڵی و چەند و چۆن نامێنێتەوە.

## وشیارکردنەوەی گەلەکەی

لەو رووەوە حەزرەتی عیسا سەبارەت بە بەدئەنجامییان وشیاری

(١) هێدی کردنەوە: ئارام کردنەوە.

کردنەوە و هەوڵی دا فکری تاقی کردنەوەی خوایان لەسەر دەرکا. چوون خوا بەرزتر و پیرۆزترە لەوەی بە بیری ئەوانا دەهات.

## لاساریی و پێداگرتن

حەوارییەکان دیسان هەر لەسەر داواکارییەکەیان رۆیشتن و رایان گەیاند، مەبەست لە پێداگرتنیان، تاقی کردنەوەی خوا نییە، بەڵکوو پێیان خۆشە وێڕای دڵنیا بوونی خۆیان [لەو بارەوە]، وەکوو بیرەوەرییەك بگا بە گوێی بەرەکانی داهاتوو و لەگەڵ تێپەڕ بوونی رۆژگارا بیگێڕنەوە و باسی لەسەر بکرێ. ببێتە بەڵگەیەك لەسەر راست بوونی ئەم ئایینە و هێژایەتی خاوەن باوەڕانی پێشوو و حەوارییە راستۆکەکان.

## چۆنیەتی رووداوەکە لە زمانی قورئانەوە

«وەختێ حەوارییەکان پرسیان: عیسای کوڕی مریەم! ئایا پەروەردگاری تۆ دەتوانێ سفرەیەکمان لە ئاسمانەوە بۆ بەڕێکا؟ جوابی دانەوە: لە خوا بترسن، ئەگەر باوەڕتان پێی هەیە. وتیان: ئێمە پێمان خۆشە لەسەر ئەو سفرەیە شتێك بخۆین؛ با دڵنیابین و باوەڕیش کەین کە تۆ لە هەموو بارێکەوە راستت لەگەڵ کردووین و ئێمەش لەوانە بین کە شایەتییت بۆ دەدەن. عیسای کوڕی مریەم وتی: ئەی خوای پەروەردگارمان سفرەیەکمان لەو ئاسمانەوە بۆ بنێرە، با بۆ ئەوەڵ و ئاخرمان جێژنێك بێ و دیاردەیەك بێ لە تۆوە. رۆزیمان پێ ببخشە، تۆ باشترین رۆزی دەری. خوا فەرمووی: من بۆتانی دەنێرم، دوایی هەرکام لە ئێوە بە درۆی دابنێ، وای سزا ئەدەم کە تا ئێستا کەسم لە

جیهاندا ئاوا سزا نەدابێ».[١]

## یەهوود کەوتنە هەوڵ بەڵکوو خۆ لە دەستی عیسا دەرباز کەن

یەهوودییان ئارامیان لێ بڕا بوو. رەقەبەریی و دژمنایەتییان گەیشتبوە دوایین پلەی خۆی و لێبڕابوون خۆ لە دەستی حەزرەتی عیسا رزگار کەن. بەو بۆنەوە شکاتیان خستە بەر حاکمی رۆمی و وتیان: عیسا مرۆیەکی بشێوێن و ئاژاوەگێڕە. لە ئایینی ئێمە هەڵگەڕاوەتەوە. گەنجەکانی هەڵخڵەتاندووین و شیفتەی خۆی کردوون. دوویەرەکیی ناوەتەوە و ئاوات و ئامانجەکانی ئێمە بە شتێکی شێتانە لە قەڵەم دەدا.

## هەڵوێستی گەڕباز و ناپاکان

بوونی عیسا بۆ فەرمانڕەوایی جێی مەترسییە. چوون مل بۆ رەژیم کەچ ناکا و گرنگی بە دەستوور نادا. لە بەرامبەر گەورەو دەسەڵاتدارانەوە خۆ بە زلزانەو بە چاوی رەخنەگرانە بۆ بیر و باوەڕی پێشینیان دەڕوانێ. پیاوێکی ئاژاوە خوازە، بێتو شەڕی لە کۆڵ نەخەن، دوایی کار لە کار دەترازێ. ئاگر ئەگەرچی کزو کەم تینیش بێ گوێ پێ نەدانی کارێکی هەڵەیە.

---

(١) مائیدە: ١١٥، ١١٢.

## گەڕ وگزی

سەرو بەری ئەو قسانەیان گەرو گزی بوون و بە رەنگی سیاسەت نەخشێنرا بوون. چوون جوولەکەکان چاك دەیانزانی خستە بەر باسی ئایین و کێشەی ئایینی سەرنجی فەرمانڕەوایان راناکێشێ و هەڵیان ناخرێنێ. سیاسەتی رەوشتی رۆمییان وابوو، خۆ لە کاروباری ئایینی یەهوود تێنەگەیەن. هەر لەبەر ئەوەش [جوولەکەکان] وتەکانی خۆیان تێکەڵاوی سیاسەت کردبوو.

## دژواریی

بۆ فەرمانڕەوایانی بێگانە و بت پەرست ـکە سەرقاڵی بەڕێوە بردنی کاروباری وڵات بوون ـ دژوار بوو، پەی بە کاکڵەی ئەو قسانە بەرن و لە مەبەستی گەلی یەهوود و دژمنایەتییان لەگەڵ عیسا تێ بگەن. بەڵام پێداگرتنی رۆژ لە رۆژ زیاتری جوولەکان و لێ پێچانی پەیتا پەیتایان، ناچاری کردن لەوکێشەیە کە ببووە دەنگ و باسی ناوکۆمەڵ، خۆ دەربازکەن.

## حەزرەتی عیسا لە دادگەدا

دادگایی عیسا کەوتبوە سەر لە ئێوارەی رۆژی هەینی و شەوی شەممەوە. چوون شەممەش رۆژی پشووی گەلی یەهوودە، دەست لە هەموو کاروباران هەڵدەگرن و هیچ ناکەن. لەو رووەوە گەلێك بە تەما و بە پەلە بوون، کە بەر لە خۆر ئاوای رۆژی هەینی، رای دادگە راگەیەنرێ، بەڵکوو لە

دەستی عیسا رزگار بین. با شەو بە خەیاڵی تەختەوە بخەون و بە دڵێکی ئاسوودەوە رۆژیان لێ بێتەوە، کە ئیتر شتێك لە ئارادا نەمابێ ئارامشیان لێ تێك بدا.

حاکم نابەدڵانە گیرۆدەی ئەم کێشەیە ببوو. چوون نەخۆی، بە دڵ خوازیاری ئەو گیر و داوە بوو، نە خێرێکی گەلەکەشی تیادا بەدی دەکرد.

جوولەکان بە نیازی بیستنی رایەکە یەکانگیر ببوون. دەمێك ئەیانکرد بە هەرا و هووریا و دەمێك خەریکی گەمە و سووکایەتی پێ کردن بوون. حاکم تەنگی لێ هەڵچنرابوو. ماوە، کەم بوو و رۆژیش بەرەو ئاوابوون دەچوو.

[لە بارو دۆخێکی وەهادا] حوکمی لە سێدارەدانی عیسا دەرکرا.

## یاسای تاوانباریی لەو سەردەمەدا

بە پێی قانوونی تۆڵەی، دەمی، حەزرەتی عیسا، سزای تاوانباری تاوان سەلمێنراو، لە سێدارەدان، واتا: کوشتن بە «چەلیپا»(١) بوو. بە گوێرەی داب‌ونەرێتی وڵاتانی پێشکەوتووش جێی لە سێدارە دان لە شوێنێکی دوورا بوو.

لە بەر زۆر بوونی حەشیمەتی یەکانگیر بوو، هەندێك ئەکەوتن بە سەر هەندێکی تردا. سەربازانی بەرپرس ـکە زۆرینەیان بێگانە بوون ـ هەموو فەرمانبەر و سەیارەت بەو گیر و داوە بێ لایەن بوون. ئەوان جوولەکەکانیان لە بەر چاو وەکوو یەك وابوو. یانی: بۆیان نەدەناسران و نەیان دەتوانی خۆیی و

(١) چەلیپا: سەلیب.

بێگانە لێك جیا بکەنەوە. ئێوارە وەخت بوو تاریکی خەریك بوو باڵی بەسەر وڵاتدا دەکێشا، کۆمەڵێك لە جوولەکان، هاوڕێ لەگەڵ دەستەیەك لاوی دڵگەرم ودووڕە ئاوەز، کەوتنە جنێو دان و تەشەر وەشاندن و ئازار گەیاندن بە حەزرەتی عیسا.

## مەسیح جەزرەبەیەکی زۆری لە خۆگواراکرد

مەسیح بە هۆی ماندوو بوون و وەستانی زۆر لە دادگەدا، هیزی لێ بڕا بوو. چێشتنی ئازاری فراوان و هەڵگرتنی چەلیپای قورس و قۆڵ، وایان لە پێ خستبوو نەیدەتوانی بە پەلە ڕێ ببڕێ.

## نەخشەی خوا

لەم کاتەدا سەربازی هاوڕێی عیسا فەرمانی بە گەنجێکی ئیسراییلی دا، داری چەلیپاکە هەڵگرێ. گەنجی دارهەڵگر، لە هەموو ئاوەڵانی خۆی توند و تیژتر و لە هەمووشیان نەزانتر بوو. بۆ جەزرەبە دانی عیساش لە گشتیان سوورتر و دڵ بەقین‌تر بوو. هەر لە تەقالادا بوو، کێشەکە بە دەست و برد ببڕێتەوە، با ئەویش لەو بەرپرسییە تەنگ پێ‌هەڵچنەی رزگار ببێ.

## لێ گۆڕان

سەرەنجام دەستەی ناو براو گەیشتنە بەر دەرکی جێی لە داردان. سەربازانی بەر پرسی ئەوێ هاتنە پێشەوە و حوکمەکەیان لە دەستی سەربازانی شاریی وەرگرت. قەرەباڵغ شڵەژا بەیەکا و بوویە قیڕە و هەرا.

یەکێ لە سەربازان نەوی لە باڵی گەنجی دار هەڵگر و پێی وابوو هەر ئەو کەسەیە وا فەرمانی کوشتنی دراوە. کوڕە هاواری لێ بەرزەوە بوو و بێ تاوانی خۆی و بێ پێوەندی بە حوکم و چەلیپاوە ڕاگەیاند. وتیشی هەڵگرتنی ئەو دارەی بە ستەم و بێگاریی بە سەردا سەپێنراوە. بەڵام چوون سەربازان لە نەژادی ڕۆمی و یۆنانی فەرمانڕەوا بوون، زمانی ئەویان نەدەزانی، و لێی تێ نەگەیشتن.

شتێکی ئاساییە کە هەموو تاوانبارێك [لە هەلو مەرجێکی وادا] خۆ بەبێ تاوان دەردەکا و ئەدا لە ژێر هاوارو گریانا. بۆیە سەربازان گوێیان پێ نەدا. گرتیان و فەرمانە [حوکمە]کەیان بەسەردا جێبەجێ کرد.

جوولەکەکان لە دوورەوە ئاگاداری کار و بار بوون. بەڵام چوون شەو و دنیا تاریك بوو؛ ئەوان لایان وا بوو کە بێگومان ئەو لە دار دراوە هەر عیسایە.[1]

## خوا عیسای بردەوە بۆ لای خۆی

خوای گەورە عیسای لە داوی جوولەکان ڕزگار کرد و بردەیەوە بۆ لای خۆی. ڕێزی شایانی لێناو لە هەرچی ستەمکاران بۆیان هەڵبەستبوو، پاکی ڕاگەیاند.

---

(١) بەڵگەی ئێمە سەبارەت بەم ڕووداوە و ئەو بارو دۆخ و کەش هەوایە کە بەسەریا زاڵ بووە، هەر ئەو بەڵگە مێژوویی و باوەڕ پێدەرانەی مەسیحییانە، کە لە سەدەی ڕابردوا سەریان هەڵداو کۆ کرانەوە. «نووسەر».

## قورئان: بەسەرهاتەکەمان بۆ ئەگێڕێتەوە

خوا سەبارەت بە گەلی یەهوود ئەفەرموێ:

«لە ڕێی خوا لایاندا و ئەو بوختانە گەورەیان بۆ مریەم هەڵبەست. [پاشان] ڕایانگەیاند: ئێمە عیسای کوڕی مەریەممان ـکە پێغەمبەری خوایە ـ کوشت. بەڵام نە کوشتیان و نە توانیشیان لە سێدارەی دەن، بەڵکوو لێیان گۆڕا و نەیانناسی. ئەو کەسانەی لەم بارەوە خەریکی کێشەن لێ نازانن و هەرچێو لە تاریکی دەکوتن. گومانی تێدا نییە کە بۆیان نەکوژرا. بەڵکوو خوا بۆلای خۆی بردەوە. خواوەن بە دەسەڵات و لە کارزانە».(١)

[بەڵێ] تا کاتێ خوای گەورە بە پێویستی بزانێ عیسا لە لای دەمێنێتەوە. خوا ئەنجامی هەر کارێکی زۆر بە دەست ئاسانە. بە ڕاستی، [چۆنیەتی] لە دایك بوونی عیسا و ژیان و هەڵسو کەوتی، لە سەرەتاوە تا دوایی هەموو جێی سەرسامی بوون. هەموو نائاسایی و سەلمێنەری توانای لە بڕان نەهاتووی خواوەنن.

## سەر هەڵدانی عیسا لە ڕۆژی سەلادا

هەر کاتێ خوا بە پێویستی بزانێ حەزرەتی عیسا سەر هەڵئەدا و بەڵگە و نیشانە بەو مەسێحی و مووساییانە کە بە باری چەپ یا ڕاستا لە ڕاستەڕێ ترازاون، پیشان دەدا. یارمەتی هەق و ڕاستی ئەدا و لایەنگرانی ناهەق تێك

---

(١) نیساء: ١٥٨، ١٥٦.

دەشکێنێ. وەکوو حەزرەتی موحەممەد (درود خوای لێ بێ) ئەو ڕاستییەی دەربڕ کردووە، کە دەم بە دەم گەیشتوە و بۆ خاوەن باوەڕان لە هەر سەردەمێکا جێی بڕوایە. قورئانیش ئاماژەی پێ کردووە و ئەفەرموێ: «هەموو ئەهلی کتێب بەر لە مەرگیان بڕوا بە عیسا دێنن و عیساش ڕۆژی پەسڵان دەبێتە شایەت لە سەریان».[(١)]

## مزگێنی حەزرەتی عیسا، لە مەڕ هاتنی حەزرەتی موحەممەد

بانگەشەی عیسا، لە بەر دژمنایەتی و پیلانگێڕیی یەهوود و نەبوونی دەسەڵات و کەم بوونی هاریکاران، نیوە و ناتەواو مایەوە. ئەو خواحافێزی لە مەردم کرد و خۆی بە قەزای خوا سپارد. مزگێنی ڕاسپاردەیەکی بە خەڵکی دا، کە دوای خۆی دێت. هەرچی ئەو دەستی پێ کردووە بە هەقە جێی دەگەیەنی و هەرچی کورت و کۆتا ڕایگەیاندوون پەرەیان پێ ئەدا. نێعمەتەکانی خوا بە هۆی ئەو دەستی مەردم دەگرن و بەڵگەو نیشانەکانی پەروەرێنیان بۆ دەردەکەوێ.

عیسای کوڕی مریەم وتی: «ئەی بەرەی ئیسراییل! من ڕاسپاردەی خوام بۆ لای ئێوە، سەلمێنەری ئەو تەوراتەش لەپێش من هاتووە و مزگانیش بێ کە پێغەمبەرێك دوای من دێ و ناوی ئەحمەدە».[(٢)]

---

(١) نیساء: ١٥٩.
(٢) سەف: ٦.

## لە تاکە پەرستی پاکەوە بۆ باوەڕێکی ئاڵۆز(١)

یەکێ لەو ڕووداوە سەر سوڕ هێنەرانەی مێژووی ئایین، کە چاوان دەخاتە گریانەوە و دڵان دێنێتە کوڵ، گۆڕانی بانگەشەی حەزرەتی عیسایە. لە تاکە پەرستی خاوێن و ئاسان و ڕێك و پێك و ڕەسەن و گەواراوە ـکە بانگەوازێك بوو، بۆ بەندایەتی خوا، وەك تەنیا پەرستووی جێی نیازی، فریاڕەسی، شایانی خۆشەویستی ـگەیاندیان بە بیر و رایەکی دژوار و فەلسەفەیەکی پڕ گرێ. ئەوسا شوێنکەوتوانی ئەوەندەیان پەسن کرد و پیاهەڵوت، لە ئاستی مرۆیان سەر خست و گەیاندیانە پلەی پەرستراویی.

وتیان: عیسا کوڕی خوایە. خوا دارای فرزەندە. لە ڕاستیدا خوا هەر عیسای کوڕی مریەمە. لەو خوای تاقانەی بێ نیازی جێ نیازە، کە نە لە کەس بووە و نە کەسیشی لێ بووە، بنەماڵەیەکی سێ کەسییان پێك هێنا، کە هەریەك پەرستوویەك بوون. ناویان لێنان: پەروەرندە و کوڕ و ڕۆحی پیرۆز.

بڕوایان بە مریەمی دایکی عیسا هێناو هێندەیان پەسندا، کردیان بە خوا و کەوتنە سوژدە لێ بردنی. پێیان ئەوت: دایکی خوا و وێنەو پەیکەریان بە پەرسگەکانیانا بڵاوە پێدا. پێڕەوانی عیسا، وێڕای هاوار لە حەزرەتی مریەم و نەزر بۆ کردنی، سەریان لێ دەخەواند و کرنووشیان لێ دەبرد. بەڵام خوا ئەو باوەڕ و کردەوە ناحەزەیانی بەر پەرچ دایەوە و فەرمووی: «مەسیحی کوڕی مریەم هەر پێغەمبەرێکە وەك هەموو ئەو پێغەمبەرانەی کە پێش لە خۆی

---

(١) ئاڵۆز: شێواو، تێك هالاو.

هاتوون. دایکی پاك و راستۆکیشی هەر ئادەمیزادێك بوو؛ کە هەر دوو خواردنیان دەخوارد. سەرنج بدە ئێمە چۆن نیشانەکانی خۆمانیان بۆ روون دەکەینەوە، کەچی هەر لە هەق لا دەدەن؟ پێیان بڵێ: ئایا بەندایەتی کەسێکی جگە لە خوا دەکەن، کە نە لە دەستی دێ زیانێکتان پێ بگەیەنێ و نە بەهرەیەکیش، خوا هەرە بیسەری زۆر زانایە».(١)

## بانگێشتی عیسا بۆ بەندایەتی تەنیا خوا بوو

عیساش وەکوو هەموو پیغەمبەران، بانگێشتی بۆ بەندایەتی تەنیا خوا بوو. ئینجیل لە زمانی ئەوەوە دەڵێ: دەبێ سوژدە هەر لە پەروەردگار و پەرستراوت ببەی، تەنیا ئەوەکە شایانی بەندایەتییە.(٢)

دیسان دەڵێ: سوژدە تەنیا بۆ پەروەرندەی تۆ دروستە و تەنیا ئەو بۆ پەرستن دەشێ.(٣)

خوای بەرزو بە شکۆش ئەفەرموێ: «شتیوا چۆن دەگونجێ، کە خوا کتێب بە کەسێك بدا؛ فێری لێزانی بکاو بیکا بە راسپاردەی خۆی، دوایی بە مەردم بڵێ: وەرن لە باتی خوا من بپەرستن! نەخێر، هەر وتوویانە: بە رووی ئەو کتێبەی فێری خوێندنەوەی بون، بەندایەتی خوابکەن. هەرگیز فەرمانی بەوە نەداوە بینە بەندەی فریشتەو پێغەمبەران. چۆن دەگونجێ پاش ئەوەی موسوڵمان بوون، پێتان بڵێن: بێن لە ئایین وەرگەرێن».(٤)

---

(١) مائیدە: ٧٦، ٧٥.
(٢) ئینجیلی مەتا: ٤/١٠
(٣) ئینجیلی لوقا: ٤/٨.
(٤) ئالی عیمران: ٨٠، ٧٩.

## قورئان بانگەشەی عیسا بە ڕۆشنی ڕادەگەیەنێ

قورئان ـکە پاڵپشت و درێژە پێدەری ڕێی ئینجیلە ـ بە شێوازێکی روون و ئاشکرا بانگێشتی عیسا بۆ تاکە پەرستیەکی پاك و پالاوتە ڕادەگەیەنێ و دەڵێ: «ئەوانەی دەبێژن: خوا هەر عیسای کوڕی مریەمە، ئاشکرایە کە لە دین وەرگەڕاون. چوون مەسیح خۆی دەڵێ: ئەی گەلی ئیسراییل! بەندایەتی ئەو خوایەی بکەن کە پەروەرندەی منیش و ئێوەشە. هەر کەس هاریکار بۆ خوا دابنێ، خوا بەشی لە بەهەشت ئەبڕێ و جێی ئاگر دەبێ؛ ستەمکارانیش یاریدەرێکیان نییە».(١)

## گرنگی تاکە پەرستی لە بانگەشەی عیسادا

خوا، بە تەرزێکی رەوان و سەرنج ڕاکێش، کە هەموو ئۆگرانی تاکەپەرستی و ڕێی و ڕەوشتی پێغەمبەران و خواناسان و خوا دۆستان بتوانن بە باشی لێی تێبگەن ئەفەرموێ: «مەسیح هەرگیز لە ژێر ئەوە دەرنەچوە کە بەندەیەکی خوایەو فریشتەکانی نزیك بە خواش، هەروا. ئەوکەسانەش حاشا لە بەندایەتی خوا دەکەن و لە خۆ دەردەچن، سەرەنجام خوا هەموویان کۆدەکاتەوە لای خۆی. ئەوانەی خاوەن بڕواو کردەوەی چاکن، جگە لە پاداشی خۆیان، چاکەی زیاتریان لەگەڵ دەکاتەوە. بەڵام ئەوانەی لە ڕێی خوا لایان داوە و دەمارگرژیی دەنوێنن، ئازاری سەختیان بەسەر دێنێ و دڵسۆز و

(١) مائیدە: ٧٢.

ئاریکارێکشیان نییە خوا نەبێ».(١)

## دیارگەیەکی دڵ بزوێنی پاشە رۆژ

قورئان بە زاراوە سوار و سەر سوڕ هێنەرەکەی خۆی وێڕای نەخشاندنی دیارگەیەك لە دیارگە دڵ بزوێنەکانی رۆژی سەڵا، حەزرەتی عیسا لەو شتانەی بۆی هەڵبەسترابوو پاك دەکاتەوە. ئەوسا پەیام و بانگێشتەکەیمان بە باشی و بە دروستی بۆ روون دەکاتەوە و پێڕەوانی هووشەباز و لە رێ دەرچووشی لەم پەیوەندەییەدا ئەخاتە بەر لۆمە و رەخنەوە. ئاشکرایە کە بەرپرسی ئەو هەڵەکارییانەش هەر بە ئەستۆی ئەوانەوەیە.

قورئان بخوێنەوە، با جوانی و دڵڕاگریی ئەو دیمەن و بارو دۆخەت چا بۆ دەرکەوێ.

کاتێ خواپرسی: عیسای کوڕی مریەم! ئایا تۆ بەو مەردمەت وتووە، دەبێ لە باتی خوا من و دایکم بپەرستن؟ وتی: پاکی هەر شایانی تۆیە، جا چۆن دەگونجێ من جگە لە راستی شتێکی‌تر [بە خەڵکی] راگەیەنم! ئەگەر شتی وام بوتایە، بێ‌گومان خۆت ئاگات لێی هەبوو. تۆ لە هەرچی بە دڵمدا بێ، ئاگاداری؛ منم کە بێ ئاگام. تۆ خۆت هەموو نادیارانت بۆ ئاشکرایە جگە لەوەی تۆ خۆت فەرمانت پێ دام، چی‌ترم پێ نەوتن؛ تێم گەیاندن هەر بەندایەتی خوا بکەن، کە پەروەردگاری منەو هی ئێوەشە. تا وەختێ لە ناویانا بووم چاو دێرییم کردن، کە بردیشمتەوە خۆت ئاگاداریان بووی. هەر

---

(١) نیساء: ١٧٣، ١٧٢.

خۆشت شایەت و چاودێری هەموو شتی. ئەگەر تووشی سزایان کەی بەندەی خۆتن و لێیشیان ببوری بێگومان هەر خۆت بە دەسەڵات و لە کارزانانی. خوا فەرمووی: «ئەمڕۆ ڕۆژێکە ڕاستان پاداشی ڕاستییەکەیان دێتەوە ڕێ. باخگەلێکیان پێ ئەدرێ کە جۆگەلەیان بە بەردا دەڕوا و بۆ هەمیشە لەوێ دەمێننەوە. هەم خوا لەوان ڕازییە، هەم ئەوان بە بەشی خوا ڕازین و ئەوەش بەهرەیەکی یەکجار گەورەو گرنگە. ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندایە هی خوان و هەر خۆیەتی بەسەر هەموو شتێکا دەستی دەڕوا».[(١)]

## لە باوەڕی ئاڵوزەوە بۆ بت پەرستی ئاشکرا

بانگەشەکارانی مەسیحی بە مەبەستی خۆ دەرباز کردن[(٢)]، خۆیان گەیاندە وڵاتانی ئەورووپایی. لە مێژبوو بت پەرستییەکی ئاشکرا لە وێدا پەرەی سەندبوو و دانشتوانی ئەو وڵاتانەش تا بناگوێیان تێی چەقیبوون.

[بۆ نموونە]گەلی بت پەرستی یۆنان، نیشانەکانی خوایان لەقاڵبی چەند پەرستووی جیا لە یەکا دادەنا، کە پەیکەریان بۆ تاشیبوون و پەرستگەیان بۆ ساز دابوون. خوای رزق و بژیو، خوای دڵسۆزیی، خوای رق و تووڕەیی. ڕۆمییەکانیش هەر لە کۆنەوە بت پەرست و خەرافە باوەڕ بوون. ئەو بیر و بۆ

---

(١) مائیدە: ١٢٠، ١١٦.

(٢) باوەکوو حەزرەتی مەسێح فەرمانی کۆچ یان سەفەرێکی وای نەدابوو و وتبووی ئەو بۆ لە ناوبردنی دابو نەریتی بەرەی ئیسرائیل و باوەڕە خەرافییەکانیان هاتووە. «نووسەر».

چوونە بە تەواویی ئاوێتەی رۆح و گۆشت و خوێنیان ببوو. ئەوانیش هەر بەندەی چەند خوای جۆراو جۆر بوون.

کاتێ بانگی مەسیحییەتیان پێ گەیشت و لە ساڵی ٣٠٦ی زایینیدا قوستەنتینی مەزن پشتیوانی لەو ئایینە تازەیە دەر بڕی و هێز و گوڕی پێ بەخشی و بە ناوی ئایینی رەسمی وڵات رایگەیاند، ئەمجا مەسیحییەت بوو بە چاو لێگەری رۆم و یۆنان. واتا: باوەڕی بت پەرستی لە رۆمییەکانەوە وەرگرت و باوەڕی فەلسەفیشی لە یۆنانەوە. پاشان بەرە بەرە ئەوەندەی تێکەڵاویی کردن تا سەرەنجام کاکڵە و ناوەرۆکی خۆی و سادەییە رۆژهەڵاتییەکەی و بوێریی تاکە پەرستییەکەی لە دەست بووەوە.

دواتر هەندێ مرۆی ناپاك و دەغەڵکار، بە باوەڕی کۆن و بت پەرستانەوە، خۆیان کرد بەریزی مەسێحییاندا و ئایینێکی نوێیان هێنایە بەرهەم، کە مەسێحییەت و بت پەرستی وەکوو یەك تیادا بەدی دەکرا.

بەڵێ، ئایینی زاڵ و پێشکەوتووی مەسێح کەوتە سەر رێگەیەك، جیا لەو رێگەی مەسێح خستیە سەری و بانگەشەی بۆ کرد. چەشنی رێبوارێك، کە لە تاریکی شەودا -چ بە خۆی زانیبێ و چ نەیزانیبێ- رێ هەڵەکا و بەرێگەیەکا بڕوا هەرگیز نەگاتەوە بە رێی ئەوەڵ.

دیارە تەنیا کەسانێکیش دەتوانن پەی بەو رازە ناسکەیە بەرن، کە مێژووی ئەو ئایینەیان خوێندبێتەوە. خوا ئەوانە بە ڕێ گوم کردوو دادەنێ؛ لە حاڵێکا جوولەکە بە گەلێکی بەر تووڕەیی کەوتوو ناو دەبا. لە زمانی موسوڵمانانەوە ئەفەرموێ:

راستە رێمان نیشاندە، رێی ئەوانەی خۆت چاکەت لەگەڵ کردوون. نەك

ئەوانەی وەبەر تووڕەییت کەوتوون. نەك ئەوانەش کە لە ڕێ لایان داوە.

ئەوەش [ڕێ گوم کردنی مەسێحییەت]چ بۆ ئەورووپا وچ بۆ مرۆڤایەتی، کە ئەورووپا ماوەیەکی دوور و درێژ ڕێبەرایەتی کردووە، گیروگرفتێکی شاراوە و نادیاری تیایە، کە [شوێنەواری] بۆ هەمیشە لەوێدا ئەمێنێتەوە و بە سەر ئەو بەشەی جیهاندا کاری خۆی دەکا.

«کارو باریش لە سەرەتاوە تا ئەنجام، هەموو لە دەستی خوادایە».(١)

(١) ڕۆم: ٤.

بۆ وەرگێڕانی ئایەکان، پتر لە هەر ژێدەرێکی دی، لە وەگێڕاوی قورئانی مامۆستا هەژار کەڵك وەگیراوە.

ڕاستکردنەوە و گەیاندنەوەی هەر چەشنە هەڵەو پەڵەیەك -بە ناو نیشانی بڵاوکەرەوە- وێڕای سپاسێکی زۆر بۆ چاپی داهاتوو، جێی سەرنج و کەڵك لێوەرگرتنە.

# ناوەڕۆك

پێشەکی، مامۆستای بانگێشتکار شەهید سەیید قوتب ............ ٥
سەیید قوتب ............ ٦
پێشەکی نووسەر ............ ٧

## کێ بتەکانی شکاندووە؟ ............ ٩

فرۆشیاری بتان ............ ٩
کوڕی ئازەر ............ ٩
پرسیاری ئیبراهیم ............ ١٠
ئیبراهیم بتەکان تێك دەشکێنێ ............ ١١
ئەم کەتنە کێ کردوویە؟ ............ ١١
ئاگری سارد ............ ١٣
پەروەرندەی من کێیە؟ ............ ١٣
پەروەرێنی من ئەڵلایە ............ ١٤
بانگەشەی ئیبراهیم ............ ١٥
لە بارەگای پادشادا ............ ١٦
بانگێشتنی باوکی ............ ١٧
بەرەو مەکە ............ ١٨
بیری زەمزەم ............ ١٨
خەونی ئیبراهیم ............ ١٩
کەعبە ............ ٢١
خانووی پیرۆز ............ ٢٢

| | |
|---|---|
| **دڵگیرترین بەسەرهات** | ۲۴ |
| خەونێکی بەلاجەوی | ۲۴ |
| ئێرەیی برایان | ۲۵ |
| تێکڕا بۆلای یەعقووب | ۲۶ |
| بەرەو دارستان | ۲۷ |
| لە بەرابەر یەعقووبدا | ۲۸ |
| یوسف لەناو چاوانەدا | ۲۹ |
| لە بنی بیرەوە بۆ ناو کۆشك | ۳۰ |
| ئەمەگناسی و ئامانتداری | ۳۰ |
| ئامۆژگاریی زیندان | ۳۱ |
| لێزانیی یۆسف | ۳۳ |
| پەندی یکتاپەرستی | ۳۳ |
| لێکدانەوەی خەو | ۳۵ |
| خەونی پاشا | ۳۵ |
| پاشا ئەنێرێ بە دوای یۆسفدا | ۳۶ |
| یۆسف خوازیاری تاقیق دەبێ | ۳۷ |
| بەرپرسیی گەنج و دارایی وڵات | ۳۸ |
| برایانی یۆسف دێن | ۳۹ |
| وتو ویژی یۆسف و برایان | ۴۰ |
| گفتوگۆی یەعقووب و کوڕانی | ۴۱ |
| بنیامین لەلای یۆسفدا | ۴۲ |
| بەرەولای یەعقووب | ۴۴ |
| نهێنی ئاشکرا دەبێ | ۴۶ |
| یۆسف ئەنێرێ بەشوێن یەعقووبدا | ۴۸ |
| یەعقووب لەلای یۆسفدا | ۴۸ |

پاشینەی پڕ خێر ........................ ٥٠

## پاپۆڕی (کەشتی) نوح ........................ ٥١

پاش ئادەم........................ ٥١
بەخێڵی شەیتان........................ ٥٢
پیلانی شەیتان........................ ٥٢
فێڵی شەیتان........................ ٥٣
وێنەی پیاوچاکان........................ ٥٤
لە وێنەوە بۆ پەیکەر ........................ ٥٤
لە پەیکەرەوە بۆ بت (هەیکەل) ........................ ٥٥
قاری خوا ........................ ٥٥
پێغەمبەر........................ ٥٦
ئادەمیزاد؛ یان فریشتە........................ ٥٧
نوحی پێغەمبەر........................ ٥٨
هۆزەکەی چیان جواب دایەوە؟........................ ٥٨
نێوانی نوح و گەلەکەی ........................ ٥٩
شوێن کەوتوانت گشت رووتەو پووتەن........................ ٦٠
بەڵگەی داراو دەوڵەمەندان........................ ٦١
بانگەشەی نوح ........................ ٦٢
نزای نوح........................ ٦٣
پاپۆڕی نوح........................ ٦٤
لافاو........................ ٦٥
کوڕی نوح ........................ ٦٦
ئەو، لە بنەماڵەی تۆ نییە ........................ ٦٧
لە دوای لافاو ........................ ٦٨

**باگژەی بەهێز** ........ ٦٩
لە دوای نوح ........ ٦٩
سپڵەیی گەلی عاد ........ ٧٠
دژمنایەتی عاد........ ٧٠
کۆشکەکانی گەلی عاد........ ٧١
هوودی پێغەمبەر........ ٧٢
بانگێشتی هوود........ ٧٣
وڵامی گەلەکەی ........ ٧٤
لێزانی هوود ........ ٧٥
باوەڕی هوود ........ ٧٦
ملهوڕیی عاد........ ٧٧
سزا........ ٧٨

**وشتری سەموود** ........ ٨٠
لە دوای عاد ........ ٨٠
پێنەزانی سەموود........ ٨١
بەندایەتی بتان........ ٨٢
ساڵح ........ ٨٣
بانگەشەی ساڵح ........ ٨٤
چاوەڕاوی دژمنانەی سەرمایەداران........ ٨٥
بۆ چوونی ئێمە هەڵە بوو ........ ٨٦
ئامۆژگاریی ساڵح ........ ٨٦
لە پێناوی ئەوەدا پاداشێکم ناوێ ........ ٨٧
وشتری خوا ........ ٨٨
نۆرە بپارێزن ........ ٨٩

یاخییەتی سەموود ........................ ٩٠
بەڵا.............................. ٩٠

## بەسەرهاتی مووسا.............. ٩٣

لە کەنعانەوە بۆ میسر......................... ٩٣
لە دوای یۆسف.......................... ٩٤
بەرەی ئیسراییل لە میسردا.................... ٩٦
فیرعەونی میسر.......................... ٩٧
سەربڕینی منداڵان......................... ٩٨
لە دایك بوونی مووسا ........................ ١٠٠
لە نیلدا ................................ ١٠٠
لە کۆشکی فیرعەوندا....................... ١٠٢
کێ شیر بە منداڵەکە بدا؟ ...................... ١٠٤
لە باوەشی دایکیا ........................ ١٠٥
بەرەو کۆشکی فیرعەون ...................... ١٠٧
مشتی گیان ئەستێن.......................... ١٠٨
نهێنی ئاشکرا دەبێ ......................... ١١٠
لە میسرەوە بۆ مەدیەن........................ ١١٢
لە مەدیەندا ............................ ١١٣
بانگ کردن ............................ ١١٤
ژن هێنان............................ ١١٥
گەڕانەوە بۆ میسر ......................... ١١٨
ڕێکەوە بۆلای فیرعەون؛ بە تەواوی یاخی بووە............... ١٢٠
ڕوو بە ڕووی فیرعەون......................... ١٢١
بانگیشتی خواپەرستی.......................... ١٢٣

موعجیزەکانی مووسا ........ ١٢٤
بەرەو مەیدان ........ ١٢٦
لە نێوا راست و درۆدا ........ ١٢٨
هەڕەشەی فیرعەون........ ١٣٠
نەزانی فیرعەون........ ١٣٢
خاوەن باوەڕی بنەماڵەی فیرعەون ........ ١٣٤
راوێژ ........ ١٣٧
ژنی فیرعەون ........ ١٤٠
مەینەتی بەرەی ئیسراییل........ ١٤٢
برسییەتی ........ ١٤٤
پێنج دیاردە........ ١٤٧
چوونە دەرەوە........ ١٤٩
چوونە ژێر ئاوی فیرعەون........ ١٥٢
لە وشکی‌دا........ ١٥٤
سپلەیی گەلی ئیسراییل ........ ١٥٦
دژایەتی بەرەی ئیسراییل ........ ١٥٧
مانگا ........ ١٥٩
دەستوور «قانوون» ........ ١٦١
تەورات ........ ١٦٤
گوێرەکە........ ١٦٧
سزا........ ١٦٩
ترسەزاڵی گەلی ئیسراییل........ ١٧١
لە رێی زاتین‌دا........ ١٧٤
لێکدانەوە........ ١٧٨
گەلی ئیسراییل لە دووای مووسا........ ١٧٩

**بەسەرهاتی شوعەیب** ........................ ١٨١

گەشتێك بە سەر ڕووداوەکانی پێشوودا........................ ١٨١

زۆرەوانی نێوان ڕاستی و ناڕاستی........................ ١٨١

شوعەیبی برایمان بەرەو مەدیەن بەڕێ کرد........................ ١٨٢

بانگەشەی شوعەیب........................ ١٨٣

باوکی دلۆڤان و مامۆستای لێزان ........................ ١٨٤

وڵامی هۆزەکەی........................ ١٨٥

شوعەیب بانگێشتەکەی شی دەکاتەوە........................ ١٨٥

لە وتەکانت شتێکی وا تێناگەین ........................ ١٨٧

شوعەیب سەری لە ڕەفتاری گەلەکەی سوڕ دەمێنێ ........................ ١٨٧

دوایین هەڕەشە........................ ١٨٨

بەڵگەی یەکلاکەرەوە ........................ ١٨٨

وتەکەیان هەر وتەی پێشوان بوو........................ ١٨٩

گەیاندنی پەیامی ئامانەت........................ ١٨٩

**بەسەرهاتی داوود و سلێمان** ........................ ١٩٠

قورئان باسی نیعمەتەکانی خوا دەکا ........................ ١٩٠

چاکەی خوا لەگەل داوود........................ ١٩١

سپاسی چاکەی خوا........................ ١٩٢

چاکەی خوا بەرامبەر سلێمان ........................ ١٩٢

تێگەیینی ورد و زانستی قوول........................ ١٩٣

سلێمان زمانی باڵندە و گیانلەبەرانی دەزانی ........................ ١٩٤

پەپووسلێمانە........................ ١٩٥

سلێمان بانگێشتی پاشای سەبا دەکا، کە بێتە سەر دینی........................ ١٩٦

پاشا پرس و ڕای بەرپرسانی دەوڵەتی دەکا........................ ١٩٦

دیارییەکی سەوداگەرانە........................ ١٩٧
پاشا بە لارە ملێیەوە دێ........................ ١٩٨
کۆشکی گەورەی لە ئاوێنە سازدراو........................ ١٩٩
هاوڕێ لەگەڵ سلێمان خۆم بە بەدیهێنەری جیهان سپارد........................ ١٩٩
قورئان سەرگوزەشتەی سلێمانمان بۆ دەگێڕێتەوە........................ ٢٠٠
سلێمان خوانەناس نەبوو........................ ٢٠٣

## بەسەرهاتی ئەیوب و یونس........................ ٢٠٤

بەسەرهاتی ئەیوب........................ ٢٠٤
خۆڕاگریی ئەیوب........................ ٢٠٥
مەینەت و بەینەت........................ ٢٠٥
بەسەرهاتی یونس و رازەکەی........................ ٢٠٦
یونس لە نێوان گەلەکەیدا........................ ٢٠٧
یونس لە زکی ماسیدا........................ ٢٠٨
خوا نزاکەی قەبووڵ کرد........................ ٢٠٨

## بەسەرهاتی زەکەریا........................ ٢١٠

نزاکەی زەکەریا........................ ٢١٠
نەزری ژنی عیمران........................ ٢١١
وتی: خوایە! خۆ کچت پێدام!........................ ٢١١
لە ژێر سێبەری دلۆڤانی خوادا........................ ٢١٢
هەواڵێك لە لایەن خوای دلۆڤانەوە........................ ٢١٣
مزگێنی منداڵ........................ ٢١٤
نیشانەکانی دەسەلاتی خوا........................ ٢١٤
خۆڕاگریی یەحیا لە پێناو دژواریی بانگەشەدا........................ ٢١٥

**عیسای کوڕی مریەم** ........................ ٢١٧
ڕووداوێکی نائاسایی ........................ ٢١٧
کاروبار هەموو جێی سەرسوڕمانن ........................ ٢١٨
ملکەچی یەهوود لە ئاستی هۆکارە ڕواڵەتییەکاندا ........................ ٢١٩
سووکایەتی و ملە پێچی ........................ ٢٢٠
چاکەی خوا لەگەل تۆرەمەی ئیسراییل ........................ ٢٢١
سپلەیی لە پێناو چاکەدا ........................ ٢٢١
دەمارگرژیی و بادیهەوایی ........................ ٢٢١
لە دایك بوونی عیسا، سەلمێنەری ناسەربەخۆیی جیهانی ........................ ٢٢٢
مادیی ........................ ٢٢٢
موعجیزەکانی عیسا ........................ ٢٢٣
بانگەوازی عیسا و بەرهەڵست وەستانی جوولەکان ........................ ٢٢٤
یەهوود ئالای دژمنایەتی بەرامبەر عیسا بەرزکردەوە ........................ ٢٢٤
هەڵسوکەوتی حەزرەتی عیسا لە قورئاندا ........................ ٢٢٤
ڕێو ڕەوشت و بانگەشەی عیسا لە قورئاندا ........................ ٢٢٧
بەربەرەکانێی لە مێژینە ........................ ٢٢٧
بڕوای خەڵکی ئاسایی و هەژار و بێدەستان ........................ ٢٢٨
ئێمە هاریکارانی خواین ........................ ٢٢٨
گەشت و بانگەواز ........................ ٢٢٩
حەوارییەکان خوازیاری سفرەی ئاسمانی دەبن ........................ ٢٢٩
بەدفەڕیی ........................ ٢٣٠
وشیارکردنەوەی گەلەکەی ........................ ٢٣٠
لاساریی و پێداگرتن ........................ ٢٣١
چۆنیەتی ڕووداوەکە لە زمانی قورئانەوە ........................ ٢٣١
یەهوود کەوتنە هەول بەڵکوو خۆ لە دەستی عیسا دەرباز ........................ ٢٣٢

کەن .................................................. ٢٣٢
هەڵوێستی گەڕیاز و ناپاکان.................................. ٢٣٢
گەڕ و گزی ........................................... ٢٣٣
دژواریی ............................................. ٢٣٣
حەزرەتی عیسا لە دادگەدا ............................... ٢٣٣
یاسای تاوانباریی لەو سەردەمەدا.......................... ٢٣٤
مەسیح جەزرەبەیەکی زۆری لە خۆ گواراکرد .................. ٢٣٥
نەخشەی خوا............................................ ٢٣٥
لێ گۆڕان.............................................. ٢٣٥
خوا عیسای بردەوە بۆ لای خۆی ........................... ٢٣٦
قورئان: بەسەرهاتەکەمان بۆ ئەگێڕێتەوە..................... ٢٣٧
سەر هەڵدانی عیسا لە رۆژی سەلادا......................... ٢٣٧
مزگێنی حەزرەتی عیسا، لە مەڕ هاتنی حەزرەتی.............. ٢٣٨
موحەممەد............................................. ٢٣٨
لە تاکە پەرستی پاکەوە بۆ باوەڕێکی ئاڵۆز.................. ٢٣٩
بانگێشتی عیسا بۆ بەندایەتی تەنیا خوا بوو ................ ٢٤٠
قورئان بانگەشەی عیسا بە رۆشنی رادەگەیەنێ................ ٢٤١
گرنگی تاکە پەرستی لە بانگەشەی عیسادا.................... ٢٤١
دیارگەیەکی دڵ بزوێنی پاشە رۆژ .......................... ٢٤٢
لە باوەڕی ئاڵوزەوە بۆ بت پەرستی ئاشکرا.................. ٢٤٣